# یادی خودا

بەرگی یەکەم

گرنگی یادی خودا لە ژیانی مرۆڤ دا

نوسینی عەلی باپیر



١٤٠٧ك

١٩٨٧ز

چاپخانەی ئیرشاد ـ بغداد
١٤٠٧ك ـ ١٩٨٧ز

# یادی خودا

به‌رگی یه‌كه‌م

## گرنگی یادی خودا له‌ ژیانی مرۆڤ دا

نووسینی عه‌لی باپیر

١٤٠٧ك ١٩٨٧ز

چاپخانەی ئیرشاد ـ بغداد

١٤٠٧ك ـ ١٩٨٧ز

# یادی خوا

ألا بذكر الله تطمئن القلوب

علی باپیر

## پێشکەش بێ

بەو بڕوادارە ڕاستانەی :

کە بە هۆی یادی خواوە گیانیان دەبووژێنەوەو
بە هۆی باسکردنی ئیسلام دڵیان دەگەشێنەوەو
هێندەیان خوا خۆش دەوێ لە بیریان ناچێتەوە .

# دوو تێ بینی گرنگ

**یەکەم : با هاوسەنگی ( تعادل ) لە نوسراوەکانمان دا هەبێ .**

ئیسلام زۆر نیشانەی وای هەن کە پێیان لە غەیری خۆی جیا دەکرێتەوە ، بەڵام سەرەکی ترینیان ـ بە بڕوای من ـ هەبوونی هاوسەنگی ( تعادل )یە ، هاوسەنگی لە نێوان دنیاو دواڕۆژ ، گیانو لەش ، ژیریو سۆزو ـ هتددا .

جا ئێمەش سوپاس بۆ خوا زنجیرە وتو وێژێکمان دەست پێ کردوە ، کە تێیاندا چارەسەری ئەو دەردو گرێ کوێرانە دەکەین ، کە لە سۆنگەی بڵاو بوونەوەی گەرای پیسی هەندێک بیرو بۆچوونو بیردۆزەی نوێۆک وبێخێری ئەملاولاڕا هێنراوەوە ، دڵو مێشکی گەلێک کەسیان نەخۆش کردوەو هەندێک کەسیشیان تووشی گومانو دوو دڵی کردوە .

بەڵام وەک گوتمان ئیسلام بەرنامەیەکی هاوسەنگە بۆیە بە پێویستم زانی هەتا دەرفەتم دەبێ زنجیرەی بنچینەکانی ئیسلامو زنجیرەی بنچینەکانی بڕوا ، دەخەینە بەر دەستی خوێنەران جارێ وەک پێشەکیو ڕێ خۆشکردنێک ، کتێبێک لە بابەت لایەنی گیانیو ئەخلاقی یەوە بخەینەڕوو ، جا ئەوەبوو خوای کار بەجێو وەڵامگۆ یارمەتی داین کە ئەم [ یادی خودا ]یە لە دوو بەرگدا پێشکەش بکەین ، کە هەتا ئەندازەیەکی زۆر هاوسەنگی لەگەڵ زنجیرەی ( دەبەرێک ڕاچوون )دا پەیدا دەکات .

مەبەستیشم لە باسکردنی ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە هەر نووسەرێکی مسوڵمان ئەم ڕاستی‌یە لە بەر چاوی خۆی بگرێ ، تاکو تووشی هەڵەی [ ئەورە کردنی یەکێك لە لابەنەکانی ئیسلام لە سەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی ] نەبێ‌و ئـەو هاوسەنگی‌یە جوانەی کە بەرنامەی خوای پێوە دەناسرێ ، بە نووسینێکی لاسەنگی هەڵە لە نێوی نەبەین •

**دووەم : کێ دەتوانێ با دەربارەی ئیسلام بنووسێ بەلام ...**

کتێبخانەی کوردیمان هـەنا بڵێی لـە بواری کتێب‌و نوسراوی ئیسلامی‌دا نەدارەو ، هەزار ڕەحمەت لەو کەسەی بێ کە بە گوێرەی توانا باسێکی بە سوود دەربارەی ئیسلام دەنووسێ بەلام ...

بەلام هەزار ڕەحمەتیش لەو کەسەی بێ کە :

١ ـ ئیسلام ناکاتە مەیدانی خۆتێدا ڕانواندن‌و تێر کـردنی غەریزەی خۆ دەرخستن‌و خۆ بە خەڵك ناساندن •

٢ ـ ئیســلام ناکاتە بابەت‌و زەمینـەی کارو کاسبی‌و بازرگانی‌و خـۆ زیاندن‌و پارە پەیدا کردن •

٣ ـ ئەگەر لـە ئیسلام‌دا سەرڕاسـت نیەو زاناو شارەزا نیـە ، جـارێ خەریکی خۆی دەبێ‌و لە خەڵکی دەگەڕێ ، چونکە کوێر فەت نابێتە چاوساغی کەس‌و ئەگەر بشبێتێ زیانی پتر دەبێ •

٤ ـ لە بەر پەلە پەل‌و تاڵووکە کردن شتی نیوەچڵ‌و نا تەواو نانووسێ ، چونکە شتی وا نەبێ چاکترە ، تاکو خەڵك سەری لێ نەشێوێ‌و ئیسلامی لە بەر چاوی نەبیزرێ •

**پێشەکی لە چەند خاڵێک دا :**

ئەی خوایە سوپاست دەکەم ، سوپاسێکی وا کە لە سامو هەیبەتی زاتتو ، پلەو پایەو بارەگای بەرزت بوەشێتەوە ، وە داوات لێ دەکەم کە هەرچی پتر پلەو پایەو ڕێزی پێغەمبەرمان ( محمد ) بەرز بکەیەوەو بەرەیی‌و پیت‌و پێز ناشی خۆتی بەسەردا برێژی ، هەروەها بەسەر خزم‌و برادەرە بەڕێزو هەمیشە خوا لەیادەکانی‌و شوێن کەوتووە ڕەسەنەکانی‌دا هەتا دنیا دنیایە •

**یەکەم : یادی خوا بۆپێویستە ؟!**

خوێنەری خۆشەویستم ! ئینسان لە ڕوانگەی ئیسلامەوە لەدوو بەشان پێکهاتوە ، ١ـ گیان (الروح) ٢ـ لەش (الجسد) ، خوای زاناو قسە لەجێ لەزۆر جێی قورئانی‌دا ئەم ڕاستی‌یەی خستۆتە ڕوو ، بۆ وێنە : « اذ قال ربك للملائكة اني خالق بشرا من طين • فأذا سويته ونفخت فيه من روحي فقعوا له ساجدين » ص – ٧١ ، ٧٢ •

واتە : کاتێك پەروەردگارت بە فریشتانی گوت : من دەمەوێ مرۆڤێکی لە قوڕێ دروست بکەم ، جا ئەگەر – جەستەکەیم – ڕێکخست‌و لەگیانی خۆم[١] فووم پێدا کرد ، ئێوە کڕنووشی – ڕێز گرتنی – بۆبەرن ئنجا بێگومان هەروەك چۆن جەستەی مرۆڤ بۆ بەڕێوە چوون‌و مانەوەی لە ژیاندا ، حەوجێی خۆراك‌و بژیوەو ، بۆ چارە

---

(١) مەبەست لە وشەی ( گیانی خۆم ) ئەوە نیە کە گیانی مرۆڤ لەخوا جیێ بۆتەوە ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە ، ئەو گیانەی کە بەس پەیوەندی بە خۆمەوە هەیەوە هەر بۆ خۆم دەزانم چی‌یەو چۆنە ••

سەرکردنی دەردو نەخۆشی‌یەکانی حەوجێی دەرمانو چارەسەرە ، گیانیش بەهەمان شێوە ، چ بۆ ژینو بەردەوام بوونی‌و چ بۆ ساغ‌و سەلامەتی‌و چارە سەر کردنی دەردەکانی ، پێویستی بە خۆراک‌و بژیوو چارە سەر هەیە .

جا بێگومان گیان « روح » شتێکی خوایی‌یەو[2] ، خۆراک‌و بژیوو دەرمانو چارە سەریشی بریتیە لە ڕووکردنە خواو لەگەڵ خوا بوونو بەندایەتی‌و گەردن کەچی ، خوای میهرەبان لەو بارەوە فەرموویەتی : « الذین آمنوا وتطمئن قلوبهم بذکر الله ،لا بذکر الله تطمئن القلوب » الرعد .

واتە . ئەوانەی بڕوایان هێنارە بە یادی خوا دڵیان دادەمرکێ ، ئاگادار بن دڵان بە یادی خوا ئارام دەگرن .

کەواتە : گرنگی‌و پێویستی یادی خواو بەرەو خوا چوونو لەگەڵ خوا بوون ، لەوە دایە کە تاقە هۆو سەر چاوەی ئارامگرتنو ئۆخژن هاتنو دڵنیایی‌و دڵ دامرکانی ئینسانە ، هەڵبەتە خوای کار بەجێ‌و زاناش حیکمەتی زۆرن لەوەدا کەمرۆڤی وا ڕەخساندوە ، بە پەرستنو خۆشویستنو یاد کردنی خوای پەروەردگاری نەبێ ئارام نەگرێ‌و سێبووری نەیەت ، بەڵام پێم وایە گەورەترین حیکمەتی خوا لەو بارەوە ئەوەیە کە ئینسان چار ناچار ڕوو بکاتە خوای خۆی‌و لێی دوورە پەرێز

---

(٢) خوای کاربەجێ فەرموویەتی : « ویسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي ٠٠ » الاسراء .
واتە : وە لەبارەی گیانەوە پرسیارت لێ دەکەن ، بڵێ : گیان شتێکی خوایی‌یەو لەکاری پەروەردگارمە .

ئەبێ ، چونکە مرۆڤ بە پشت لە خوا کردن و دوورە پەرێز بوونی وەک ڕووەکێ بێ ئیشک سیس و بێ‌دەو دەبێ و زۆر بێ ئاچێ ئیشک هەلدەوەڕێ و دەمرێ •

**دووەم : جێ شوێنی یادی خوا لە بەرنامەی ئیسلامدا :**

بەرنامەی ئێرو تەواوی ئیسلامەتی وەک خانوویکی ڕێک و تەواو وایە ، هەر شتەی لەجێی شیاوو گونجاوی خۆیدا ڕۆنراوە ، ئنجا هەر وەک چۆن ئەگەر بێت و هەرکام لە دەرگاو پەنجەرەو هەیوان و سەربان و حەوشەو •• هتدی خانووەکە جێ گۆڕکەیان پێ بکرێ ، یان لە ئەندازەی سروشتیی خۆیان گەورەتر بکرێن لە سەر حیسابی شتەکانی دیکە ، یان هەر لا ببرێن و شوێنەکانیان بە شتێکی دیکە پڕ وەکرێ ، دیمەنی خانووەکە تێک دەچێ و دەشێوێ و ، ڕەنگە هەندێک جاران هەر لەوەش بشۆڕێ کە پێی بکوترێ « خانوو » !

ئیسلامەتیش بە هەمان شێوە ئەگەر بێت و لەو شێوەو چۆنیەتی‌یە ڕێک و ڕێکەی خوا دیاری کردوە ، بگۆڕدرێ بۆ هەر شێوەیەکی دیکە ئەوە تێک دەچێ و بە مەرەدی خانوەی غۆرین دەچێ •

جا یەکێک لەو شتانەی کە پێکهێنەرێکی ڕەسەن و بنەڕەتی‌یە لە ئایین و بەرنامەی خوادا ، یادی خوایە ، بەڵام یادی خوا ، وەک خوا فەرموویەتی و دیاری کردوەو ، پێغەمبەری خوا ﷺ و تێکۆشەر شێوەو چۆنیەتی و ئەندازەی خستۆتە ڕوو وبە کردەوە ڕای نواندوە •

جا وەک کە باسی « پلەو پایەی یادی خوا »دا ڕوونی دەکەینەوە ، یادی خوا پلەو پایەیەکی یەکجار بڵیندو مەزنی هەیە لە ئایینی خوادا ،

بـەڵام :

١ ـ بەرنامەی خوا بەس بریتی نیە لە یادی خوا •

٢ ـ وە یادی خـوا دژایەتی‌و ناکۆکی لەگـەڵ خـەبات‌و تێکۆشاندا نیـە •

بەرنامەی خودا بەس یادی خوا « ذکر الله » نیە ، چونکە یاد کردن بـەس پەیوەندی‌یـەکی دەروونی‌و مەعنـەوی‌یەو هیچی دی ، بـەڵام بـەرنامەی خـوا دەرو دەروون ( ظاهـر وباطـن )ی تاک‌و کۆمـەڵ دەگرێتەوەو ، بـەرێوە نابرێ بـەبێ پەیوەندی هـەبوونێکی‌وا لەگـەڵ خـوادا ، کـە هـەموو لایەنەکانی مرۆڤ‌و هـەموو ڕووەکانی ژیانی‌و چالاکی‌و جم‌و جووڵە کۆمەڵایەتی‌و سیاسی‌و ئابووری‌یەکانی بگرێتەوە •

وە یادی خوا دژایەتی لەگەڵ تێکۆشاندا نیە ، چونکە ڕەنج دان‌و تێکۆشان لە پێناوی خوادا بەرهەم‌و ئەنجامی یادی خودایە ، واتە هـەر کاتێك مرۆڤ بەڕاستی یادی خوای کردو بـەدڵ خوای خۆشویست‌و لەگەڵی تێکەڵ بوو ، ئەو خۆشەویستی‌و تێکەڵ بوونە پاڵی پێوە دەنێ کە لـە پێناوی ئەو خوایەدا کە هێندەی خۆش دەوێ ، هەموو شتێك بەخت بکات‌و هەر چی لە دەست دێ بیکات •

کەواتە :

ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ : « ألا أنبئكم بخير اعمالكم وازكاها عند مليككم ، وارفعها في درجاتكم ، وخير لكم من انفاق الذهب والورق وخير لكم من ان تلقوا عدوكم فتضربوا اعناقهم ؟! قالوا : بلى ، قـال

ذكر الله »[٣] لەگەڵ ئەو فەرموودەیەدا کە دەڵێ : « وذروة سنامه الجهاد »[٤] هیچ دژایەتیو ناکۆکیان نیە ، چونکە بەڵێ لە قۆناغی یەکەمدا یادی خوا وەک پێشەکیو بنچینە لە هەموو شتێکی دیکە گرنگترو لەپێش ترو گەورەترە ، لە بەر ئەوەی ئەگەر بێتو مرۆڤی مسوڵمان یادی خواو لەگەڵ خوا بوونی تێدا نەیەتە دی کردارو ئاکارو چالاکیە چاکو پەسندەکانی تێدا نایەنە دی ، وە ئەگەر گریمان هاتنە دیش قرپۆکو بێ خێر دەبن ، بەڵێ لە قۆناغی یەکەمدا یادی خواو عیشقو خۆشەویستی هەبوون سەبارەت بە خوا لە هەموو شتێک گرنگترو لە پێشترە ، تەنانەت لە تێکۆشان « جهاد »یش ، چونکە وەک گوتمان تێکۆشان ئەگەر بێتو زادەو بەرهەمی یادی خواو خۆشویستی خوا نەبێ ئەگەر گریمان پەیداش بوو بێ کاکڵو کەم خایەن دەبێ •

بەڵام لە قۆناغی دواتردا ـ واتە دوای ناسینی خواو دڵ پڕ بوون لە عیشقو خۆشەویستیو ڕێزو سامو هەیبەتی خوا ـ تێکۆشانو شۆڕشکردن دژی کوفرو زۆرداری طاغووت لە هەموو شتێک مەرج ترو پێویست ترە ، چونکە لەو حاڵەدا تێکۆشانو شۆڕشکردن دەبێتە بەڵگەو شایەدێکی پێویست بۆ سەلماندنی هەبوونی بڕواو ڕاستیی یادی خواو خوا خۆشویستن •

ئنجا تێکۆشانو ڕاپەڕین بۆ گۆڕینی واقیعی نا ئیسلامیو طاغووتانە ، بە لووتکەی هەرە بەرزی ئیسلام دانراوە ، چونکە هەروەک چۆن

---

(٣) ڕاویو واتای ئەم فەرموودەیە لە باسی « پلەو پایەی یادی خوا »دا • خراونە ڕوو •

(٤) ئی ئەم فەرموودەیەش لە بەشی هەشتەم دا •

کاتێک دوژمن بەوێ بە سەر شوێنێکدا زاڵ بێو بیخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە ، لە پێشدا هەوڵی داگیر کردنو دەست بە سەردا گرتنی لوتکەو بەرزاییەکان دەدات ، بۆ ئەوەی دواتر بە ئاسانی بە سەر هەموو ناوچەکانی دیکەدا زاڵ بێ ، هەر کاتێکیش دوژمنو ناحەزانی ئاینو بەرنامەی خوا ، توانیان بە سەر لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلام ( تێکۆشان )دا زاڵ بنو لە بیرو مێشکی خەڵکی موسڵمانی دەربێننو لە بەرنامەی خوای بقرتێنن ، مانای وایە لای سەرەوەیان لە ئیسلام گرتوە بە سەر هەموو لایەنەکانی دیکەی ئیسلامەتیدا زاڵ بوونو خستوویانەتە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە .

کەواتە :

لە و لایەنەوە کە یادی خواو عیشقو خۆشەویستی هەبوون سەبارەت بە خواو پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم کاکڵو نێوەڕۆکو بنچینەو بنەڕەتی ئیسلامەو ، زەمینەی لە سەر چەقینی هەموو لایەنەکانی‌یەتی ، لە هەموو کردەوەیەک چاکترو گەورەترەو ، لە بەشینەوەی زێڕو زیوو هەڵبڕینی ئەستۆی دوژمنان خێرترە .

وە تێکۆشانو شۆڕشکردنیش لە ڕێی خوادا لەو لایەنەوە کە بەرهەمو بەڵگەو شایەدی ئیسپاتی بوونی بڕوایەو ، لووتکەی هەرە بڵیندیەتیو سەنگەری پاراستنیەتی ، ئەگەر ئەم نەبێ یادی خواو نوێژو ڕۆژوو زەکاتو حەجو .. هتد کاکڵو نێویان تێدا نامێنێو وەک شتێکی بێ ئەمەیەت دەکەونە بەر دەستو پێی طاغووتو زۆر دارە خوا نەناسەکان ، بەڵێ لەو لایەنەوە تێکۆشان لەڕێی خوادا بە گەورەترینو بەنەوترین بەندی ئاین دادەنرێ .

یانی هەر وەک چۆن یادی خوا ناسی‌و خوا خۆشویستن پیشەکی بوو بە هۆی پەیدا بوون‌و سەرهەڵدانی شۆڕش کردن‌و تێکۆشان لە ڕێی خوادا ، دواتر تێکۆشان‌و خەبات پاداشتی ئەو چاکەیەی یادی خوا دەداتەوەو بەرێز داری لێ دەکات •

ئنجا هەر وەک چۆن پێهاتنی ئینسانی موسوڵمان‌و کۆمەڵی موسوڵمان بە یادی خواو پەیوەندی لەگەڵ خوا بەستن‌و بەرەو خوا چوون‌و خوا ناسی دەست پێ دەکات‌و ، بە پەیدا تێکۆشان‌و شۆڕش‌و هێنانەدی حوکمی خواو بەڕێوە بردنی بەرنامەکەی کۆتایی پێ دێ • ڕووخان‌و تێکچوونی کەسایەتی مرۆڤی موسوڵمان‌و کۆمەڵگای موسوڵمان بە لاچوونی حوکمی ئیسلامی‌و لە کارکەوتنی بەرنامەی خوا دەست پێ دەکات‌و ، بە پووکانەوەو تۆوەڕۆک لە دەست دان‌و پووچەڵ بوونی یادی خواو نوێژو ڕۆژووو وحەج‌و زەکات‌و باقی درووشمەکانی ئیسلام کۆتایی پێ دێ •

بەڵێ بەبێ تێکۆشان‌و شۆڕش کردن لە پێناوی خوادا نەک هەر یادی خوا بەڵکو هەموو شتەکانی دیکەی ئیسلامەتی زەردو سیس دەبن‌و دەبنە قاوغ‌و توێکڵێکی بۆش‌و بێ کاکڵ ، چونکە طاغووت دەیانخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو ، دەیانکاتە دەستەگیرەی خۆی‌و بۆ چاو بەستنی خەڵکی‌و بێ چەقاندنی خۆی‌و هێشتنەوەی ڕژێمەکەی بەکاریان دێنێ ، بەڵێ بە هۆی نەبوونی تێکۆشان‌و جم‌و جووڵ لە پێناوی خوادا مزگەوت‌و تەکیەو خانەقاکان کە جێگەی خوا تێداپەرستن دەبنە جێگەی طاغووت تێدا پەرستن ، وە مینبەرو میحڕابەکان کە شوێنی هەق تێداگوتن‌و ئیسلام تێدا خستنەڕوون ، دەبنە جێگەی هەق تێدا گۆڕین‌و ڕاگەیاندنی فەرمانەکانی طاغووت ، وە وتارو کۆڕەکان کە هۆی خەڵک

ورياكردنەوەو خوا بەخەڵك ناساندنو دووعاكردنن بۆ حوكمو بەرنامەی حوا ، دەبنە هۆی خەڵك بێ هۆش كردنو طاغووت بە خەڵك ناساندنو دووعا كردن بۆ حوكمو ڕژێمی طاغووت •

كۆتایی ئەم باسەش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دێنین كە دەفەرموێ : « انه یكون بعدي امراء یعملون بغیر طاعة الله فمن شركهم في عملهم واعانهم على ظلمهم فلیس مني ولست منه ، ومن لم یشركهم في عملهم ولم یعنهم على ظلمهم فهو مني وانا منه • » رواه ابو داود ــ منهاج الصالحین لاپەڕە (٤٦٨) ، عزالدین بلیق ، چاپ ٣ •

واتە :

بێگومان دوای من كار بەدەستانێك پەیدا دەبن ، كە لە فەرمانبەریو ڕەزامەندیی خوادا كار ناكەن • جا هەر كەسێك لە كردەوەیاندا بەشداریی بكاتو ، لە سەر ستەم كردنیان یاریدەیان بدات ، ئەوە لە من نیەو ، من لەوی نیم ، وە هەر كەسێك لە كرداریاندا بەشدار نەبێو لە سەر ستەم كردنیان یاریدەیان نەدات ، ئەوە لە منەو منیش لەویم •

وەك دەبینین پێغەمبەری خواناسو بت شكێنو طاغووت خەسێنو كافر ڕەتێنو دوژمن تۆقێنو شەیتان بەزێنو گەل ڕزگار كەرو ئازادی هێن صلی الله علیه وسلم ، بەرهەڵستی كردنو ڕاپەڕین دژی طاغووتو زۆر دارانێك كە دەسەڵاتو زەبرو زەنگی خۆیان بە سەر خەڵكیدا دەسەپێننو لە جیاتی بەرنامەی خوا هەواو بیرو بۆچوونی خۆیان یان مرۆڤێكی وەك خۆیان دەكەنە دەستووری ژیانی بەندەكانی خوا بە بنەڕەتی ترینو سەرەكی ترین مەرجی مسوڵمانەتی بە شوێن كەوتووی

پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم لە فەرمووده‌یەکدا دەرمان دادەنێ، کەواتە: ئەگەر هێندە نوێژان بکەی تا نێو چاوانت توێخێکی بە بەرماڵێوە دەچێ‌و، هێندە وەڕاڕێی هەتا بن هەنگلت دەتەزێ‌و، هێندە حەجان بکەی هەتا بنی پێیات دەسوێ‌و، هێندە یادی خوا بکەی هەتا کرکرەت شین دەبێ‌و زمانت شل دەبێ‌و دەنگت دەنووسێ، ئاگات لە دنیایە دەبڕێ، مادام دژی ئەو طاغووت‌و زۆر دارە کافرانەی کە بەپێی بەرنامەی خوا حوکم ناگێڕن هیچ هەڵوێستێك پیشان نەدەی‌و، لە گۆڕین‌و ئاڵ‌و گۆڕ کردنی ئەو واقیع‌و بارو دۆخەدا کە ڕژێمی طاغووتی هێناویەتە کایەوەو، خواو پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم پێی ڕازی نین هەوڵێك نەدەی‌و مشوورێک نەخۆی، پێغەمبەری پێشەوامان صلی اللە علیە وسلم بە سەربازو شوێن کەوتووی خۆی حسێبت ناکاو، گوێت پێ نادات.

سێیەم: تێکۆشان بەبێ یادی خوا نایەتەدی، وە ئەگەر گریمان هاتە دیش قرپۆک دەبێ.

خوای زاناو توانا فەرموویەتی: « ألم تر الى الذين قيل لهم كفوا ايديكم واقيموا الصلاة وآتوا الزكاة، فلما كتب عليهم القتال اذا فريق منهم يخشون الناس كخشية الله او اشد خشية، وقالوا ربنا لم كتبت علينا القتال لولا أخرتنا الى أجل قريب قل متاع الدنيا قليل والآخرة خير لمن اتقى ولا تظلمون فتيلا . أينما تكونوا يدرككم الموت ولو كنتم في بروج مشيدة .. » النساء ــ ٧٧، ٧٨ .

واتە:

---

ئایا تەماشای ئەوانە ناکەی کە پێیان گوترا دەستی خۆتان بپارێزن ــ واتە ــ جەنگ مەکەن ــ وە نوێژێ بەرپا بکەن‌و خۆ پاک وەکەن،

جا کاتێك جەنگیان لە سەر پێویست کرا ، کۆمەڵێك لەوان هێندەی خواو بگرە پتریش لـە خەڵکی ـ کافر ـ دەترسـان ، وەکوتیـان : ئـەی پەروەردگارمان بۆچی جەنگت لە سەر پێویست کردین ! بۆ تا ماوەیەکی بێزیك دوات نە دەخستین ؟! ـ ئەی پێغەمبەر پێیان ـ بڵێ ڕابواردنی دنیا شتێکی کەمە ، وە دوا ڕۆژ چاکترە بۆ کەسێك پارێز بکات ، وە هێندەی تویژای تەنکی سەر دەنکە خورما ، ستەمتان لێ : ناکرێ ، لە هـەر جێیەکیش بن مردن هریانان دەکەوێ ، ئەگەر لە قەڵای قایمو مەحکەمیش دابن ..

زاناو ڕوێژەرەوانی قورئان دەربارەی هۆی هاتـە خواری ئـەم ئایـەتانە چـەند ڕیوایەتێکیان باس کردوون ، کـە پوختەی مەبەستیان ئەوەیە کە هەندێك لە برادەرانی خوێن گەرمی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لـە کاتێکدا کە لـە شاری مەککەی پیرۆز بوونو جارێ بەس فەرمانیان پێ کرابوو بە نوێژ کردنو دەروون پاککردنەوە ، هاتە لای پێغەمبەرو پێیان گوت ڕێگەمان کە لەگەڵ کافراندا بجەنگێین ، بەڵام پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم داوایەکەی وەرنەگرتنو فەرمووی : جارێ فەرمانم پێ کراوە بە چاوپۆشیو خۆڕاگریو جەنگ مەکەن . ئنجـا کاتێك چوونە شاری مەدینەو جەنگو تێکۆشانیان لەسەر پێویست کرا کۆمەڵێکیان هەڵویستیان ئەوەبوو کە خودا باسی کردوە[٥] .

**جا ئێستا با ڕامێنین :**

وەك دەبینین دەستەیەك ئەوانەی کـە پێغەمبەری لێزانو کار

---

(٥) بڕوانە ( جامع البیان في تفسیر القرآن ) محمد بن جریر الطبري ، ب٤ لا (١٠٨) ، وە بڕوانە ( تفسیر القرآن العظیم ) ابن کثیر ب١ لا (٥٢٦) ، وە بڕوانە ( في ظلال القرآن ) ب٢ لا (٧١٣) .

بەجێ خەریکی پەروەردەکردنو بە خوا وەنیزیک خستنەوەو دەروون پاک کردنەوەو بارهێنانیان بوو . لەبەر سادەییو بیر کورتیو پشوو سواریو خۆ ڕانەگریو تەنگە پرنسکەییو ، بیر کردنەوەی ناواقیعی یانەو خەیاڵیو خۆ نەناسینو دوژمن نەناسین ، بەو شێوازو جۆرو چۆنیەتی یەی کار کردنی پێغەمبەر صلی اللە علیە وسلم قایل نەبوونو کۆمایان وای لێ حاڵی کردبوون کە ئەوان لە پێغەمبەر شارەزاترنو چاکتر دەزانن چ بکەنو چۆن ئیش بکەن !!

بەڵام بێگومان پێغەمبەری مامۆستاو پێشەوا صلی اللە علیە وسلم لە سۆنگەی ئەوەوە کە بەپێی ڕێبرووونی خواو لە ژێر چاودێری وی‌دا بەڕێوە دەچوو ، وە لە بەر ئەوەی سروشتی ئایینو بەرنامەی خوای چاک دەناسیو تواناکانی خۆیو شوێن کەوتووانیو ، توانای دوژمنانیشی دەزانی چۆنەو چەندە ، ڕچەو ڕێڕەوی خۆی تێک نەداو گوێی نەدایە هەلەهەلو پەلەپەلی ئەو جۆرە کەسانەو لە سەر تەواو کردنی ئەرکو جێ بەجێ کردنی نەخشەی خۆی بەردەوام بوو ، هەتا لە ئاکامدا درەختی ڕەنجو خەباتو تێکۆشانو خۆ ڕاگریی بەری گرتو توانی شوێن کەوتووانی خۆی بگەیەنێتە قۆناغی تێکۆشانی چەکدارانەوەو دوای خۆ داکوتانو نیشتەجێ بوونیان لە شاری مەدینەدا بانگی جەنگو شۆڕش لێ‌دراو ، کۆمەڵی . خوا لەیادو دەروون پاککراوەو دڵ بە خواوە بەستراوو پارێزکار بەرەو جەنگو کوشتاری طاغووتو ملهوڕانی کافرو خوا نەناس دەنگ درا .

---

هەڵبەتە کەسانێك کە قۆناغی فێر کردنو پاککردنەوەو پەروەردە مرحلة التعلیم والتزکیة والتربیة یان بە سەلامەتیو ڕێكو پێکی

بڕیبوو تەواو کردبوو بێ درەنگ ئامادەیی خۆیانیان دەربڕی‌و دەستیان لە سینگی خۆیان‌داو گوتیان فەرموو ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی خۆمان بخەینە دەریاوە تاقە یەکێکمان لە فەرمانت دەرناچین !(٦)

بەڵام ئەوانەی کە قۆناغی بڕوا دامەزرانو دڵ دامرکان‌و دەروون پاک بوونەوەیان تەواو نەکردبوو ، لە بەر تاڵووکەو هەڵەشەیی‌و دڵگەرمی‌و پشوو کورتی‌و بێ حەوسەڵەیی نەیان توانی بوو وەک پێویست خۆیان باربێنن‌و خۆیان سازو ئامادە بکەن ، نەک هەر بێ هێزی‌و نائامادەیی خۆیان پیشاندا ، بەڵکو لە وەش بەولاوە دەستیان کرد بە دەربڕینی چەند قسەو بیرو ڕایەک کە بە هیچ جۆرێک ناگونجێ لە دڵێکی ساغ‌و سەلیم بەیدا بن‌و ، قەت لە ئینسانی خواناس‌و مسولمان ناوەشێنەوە وەک :

ترسان لە غەیری خوا هێندەی خواو بگرە پتریش .

ڕەخنە گرتن لە خوا کە بەدەبوو جارێ جەنگیان لە سەر پێویست بکات . گلەیی‌و گازندە کردن لە خوا کە بۆ چی تا کاتێکی نزیک دوای نەخستن ؟ ئنجا خوای ورد بین‌و دڵ خوێنەرەوەو شارەزا بەڕازو نهێنی‌یەکانی ، بە تیشکی چەند وشەیەکی کەم ماک‌و سەر چاوەو ڕەگ‌و ڕیشەی ئەو جۆرە بیرو ڕاو قسە نامسوڵمانانەو هەڵوێستە ترسنۆکانەو دڵە خۆشانەیە دەشکێنێ‌و دەخاتە ڕووو پێیان دەڵێ :

---

(٦) ئەمە قسەی ( سعد بن معاذ ) بوو لە سەرەتای جەنگی بەدردا ، بڕوانە : ( السيرة النبوية لابن هشام ) ب٢ لاپەڕە (٢٦٧) .

که ئێوه بۆیه ئێستا کەباسی تێکۆشانو جمو جووڵ دەکرێ ترستان پێ دەنیشێو دڵتان دەلەرزێو دنیاتان لێ وێک دێ چونکه :

١ ـ له قۆناغی پێشوودا به سەبەب دەروونی خۆتان دا زاڵ نەبووونو له خۆشەویستی ژیانی دنیا پاکتان نەکردۆتەوەو ڕابواردنی دنیاتان کردۆته ئامانجی هەره بەرزی ژیانتان ، بەڵام زۆر چاک بزانن که ڕابواردنی دنیا شتێکی کەمو نابووتەو شایستەی کرانه ئامانج نیـه .

٢ ـ ئێوه چونکه له قۆناغی پێشوودا خەسڵەتی پارێزکاری « تقوی » تان له خۆتاندا نەهێناوەته دی ، نەتان توانیوه پەی بەوه بەرن که ژیانی دوارۆژ چاکترو تەواوترەو پێویسته مرۆڤ وەدەست ـ هێنانی وی بکاته مەبەستو ئامانجی هەره بەرزی نـەک شتێکی دیکه .

٣ ـ وه له بەر ئەوەی پێشتر قۆناغەکانی بەرەو خـوا چوونو خـوا ناسی تان نەبڕیون ، نەتان توانیوه بگەنه دڵنیاییو قەناعەت له وەدا که خوای دادگەرو میهرەبان پاداشتی چاکه کانتان وێ دەداتەوەو ستەمتان لێ ناکات .

٤ ـ وه ئێوه هەتا ئێستا نەتان توانیوه پەی بـەوه بەرن کەمردنو ژین به دەست خودانو ، جەنگ کردنو نەکردن ، وه خۆ شاردنەوەو خۆ نەشاردنەوه لـه ئاقار ویستی خوادا هیچ دەوریکیان نیه لـه هێنانەوەو قوتار کردنی بیساندا .

جا وەک دەبینین خوای کار بەجێو زانا هۆی بەزینو ترسانو جەنگ پێ نەکرانو سڵەمینەوەی ئـەو دەستـەیه دەگێڕێتەوه بۆ پێنـج

ستان :

١ ـ هەڵبژاردنی ڕابواردنی دنیاو ، دنیا کردنە ئامانج •

٢ ـ نەبوونی خۆشەویستی ژیانی دواڕۆژ ( بەهەشت ) •

٣ ـ نەبوونی خەسڵەتی پارێزکاری ( تقوی ) •

٤ ـ دڵ دانەمەزران لە سەر ڕاستی پاداشتی دوا ڕۆژو دادگەری خوا •

٥ ـ ترسان لە مردنێ •

کەواتە :

هەتا ئێرە ڕاستیو تەواویی نیوەی یەکەمی سەر باسی ئەم باسە سەلمێنرا بەڵێ ڕاستە : « تێکۆشان بە بێ یادی خوا دروست نابێ » ، چونکە هەر وەک چۆن بناغەی دیوار ئەسڵو بنچینەیەتیو دیوارەکەی لەسەر ڕادەوەستێ ، یادی خواو تێکەڵ بوون لەگەڵ خواو عیشقو خۆشەویستی هەبوون لەگەڵ خواش سەر چاوەو بنچینەی هەموو جمو جووڵو چالاکیو ئاکارو کردەوەکانی مرۆڤە ، نەک هەر تێکۆشانو خەبات لە ڕێی خوادا •

ئێستاش بچینە سەر نیوەی دووەمی سەر باسی ئەم باسەو بزانین چۆن ، « تێکۆشان کە یادی خوا نەبووبێتە بنچینەی ئەگەر هەشبێ درێۆکە » ؟!

**خوای زانا فەرموویەتی :**

« ولقد صدقكم الله وعده اذ تحسونهم بأذنه حتى اذا فشلتم وتنازعتم في الأمر وعصيتم من بعد ما أراكم ما تحبون منكم من يريد الدنيا ومنكم

من يريد الاخرة ثم صرفكم عنهم ليبتليكم ••• » آل عمران ــ ١٥٢ •

واتـه :

وه بێگومان خوا ئَفتی خۆی ڕاست بردە سەر لەگەڵتان ، کاتێك کە بە فەرمانی خوا دەتان کوشتن ، هەتا کاتێك کە ترسان وە لە کارو باری جەنگدا ناکۆکیتان تێ کەوت • وە دوای ئەوەی ئەوەی کە خۆشتان دەوێ پیشانی دان ــ کە تالانە ــ سـەرپێچی تان کرد ــ لـە فەرمانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ــ هەندێکتان ئەن دنیایان دەوێ و ، هەشتانە دوا ڕۆژی دەوێ ، ئنجا خوا ئێوەی لە وان لادا تا تاقیتان بکاتەوە ••

وەك دەبینین خودا « جل جلاله » بەزینو تێشکانی مسوڵمانان لـە جـەنگی [ ئوحوود ]دا دەگێڕێتەوە بۆ زنجیرە هۆیەك کـە هـەر یەکێکیان لە وەی پێش خۆی پەیدا دەبێ هەتا دەگاتە سەر هۆی کۆتاییو نەڕەتی • کە بنچینەو سەرچاوەی هەموو هۆیەکانە ترسان ــ دووبەرەکی ــ سەرپێچی ــ هەوڵدان بۆ گرتنی تالان ــ هەڵبژاردنی دنیا •

بەڵێ « هەڵبژاردنی دنیـا » کـە بـە هۆی بڕوا دانەمەزرانو دڵ دانەمرکانو دەروون بزار نەکرانـەوە پـەیدا دەبێ ، بوو بـە هـۆی هـەوڵدانو گـەڕان بۆ وەدەسـت هێنـانی تالان « غنیمـة » ، وە تالان خۆشویستن سەری کێشا بۆ شکاندنی فەرمانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم و هاتنە خوارەوەی تیر هاوێژەکان لە سەر شاخی ئوحوود ، ئەو فەرمان شکاندنو سەر پێچی یەش بوو بە هۆی پەیدا بوونی دوو بەرەکیو ناکۆکی ، ئەمیش بوو بە هۆی تێشکانو بەزینو سەنگەر چۆل کردن !!

کـەواتە :

ڕاستە تێکۆشانو شۆڕش کردن لە ڕێی خوادا بە بێ بەرەو خوا

چوونو یادی خواو دڵ دامەزرانو دەروون پاڵێوران نایـەتە دی ، وە ئەگەر هاتە دیش حەتمەن ئەنجامەکەی هەرەس هێنانو بەزینو سەنگەر بەجێ هێشتنو ڕاکردنە •

بەڵێ تێکۆشانو شۆڕشی ڕاستەقینەو بەرهەمدار ئەو شۆڕشەیە کە کەسانێک بەڕێوەی دەبەن چەندە بیرو هۆشیان بە لە ئیسلام حاڵی بوون ڕووناک بونەوە ، دەقاتی ئەوەش دڵو دەروونیان بە یادی خواو ڕێزو شەرمو سامو خۆشەویستی خوا پڕ بووەو ئاوەدان بۆتەوە ، وە چەندە هیواو ئاواتی سـەر کەوتنو زاڵ بوونیان لـە مێشکێدا هـەیە ، دەقاتی ئەوە ، ئارەزووی شەهید بوونو بە خزمەت خواو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گەیشتنو بە دیدار شاد بوونیان لە دڵ داهەیە •

**چوارەم : یادی خوا خەسڵەتێکی بنەڕەتی هەموو مسوڵمانێکە :**

کەسانێکی بیر کورتو کەڵە ئیشکو لاسا کەرەوە هەن کە لە سەر بنچینەی قورئانو سوننەت لە ئیسلام حاڵی نەبوونو ، ئیسلامێکی نامۆو یەکلایەنەیان بۆ خۆ ساز کردوە ، وا دەزانن یادی خواو ساف کردنەوەی دڵو لەگەڵ دەروونـدا جـەنگان ، خـەسڵەتێکە بەس ئی سۆفی یەکانەو لـە سەر وان تەرخان کراوە ، جا ئـەو جۆرە کەسانە هـەیانە سـۆفی مـەشرەبەو هـەشیانە بـە پێچـەوانەوە دژی ڕێبـازو « تصوف » ە •

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو جۆرە کەسانە سۆفی مەشرەب بن یان نا ، زەینیان خلیسکەی پێ بردوونو ، بە هەڵەدا چوون ، چونکە یەکەمینو سەرەکی ترین خەسڵەتو نیشانەی جوێ کەرەوەی مرۆڤی خوا ناسو

مسوڵمان لە غەیری خۆی ، ئەوەیە کە ئینسانی مسوڵمان گەیشتن بە ڕەزامەندی خوا بە بەرز ترین و پیرۆز ترین ئامانجی ژیانی دەزانێ و خودا تاقە بەروەردگارو پەرستراوو خۆشەویست و گەورەیەتی ، ئنجا لە بەر ئەوەی ناتوانێ وەک پێویست ئەرکی بەندایەتی ی خۆی سەبارەت بە خوا جێ بە جێ بکات و ، خوا لە خۆی ڕازی بکات ، هەتا وەک پێویست ئاشنای نەبێ و نەیناسێ و ، ناشتوانێ وەک پێویست پێی ئاشنا بێ و بیناسێ ، هەتا بە دڵ و گیان بۆ لای نە چێ و بە هەموو توانایەکی یەوە خۆی بۆ یەکلا نەکاتەوەو ، هەتا دەتوانێ لەگەڵ خەسڵەتە بەدەکانی نەفسی دا نەجەنگێ و هەڵی نەوێژێرێ و بزاری نەکات و ، ئاوێنەی دڵی لە تۆزو خۆڵی خۆ پەرستی و دنیا دۆستی و ئارەزوو ویستی قوتار نەکات ، بەڵێ لە بەر جەنگی دەروونی « جهاد النفس »و خۆ ساف کردنەوە(٧) « تصوف »و پاککردنەوەی دەروون « تزکیة النفس »و پەروەردە « تربیة » .. خەسڵەتێکی بنچینەیی و سەرەکی یە لە هەموو مسوڵمانێکی ڕاست و کامڵ دا .

بەڵێ مادام پاڵاوتنی دەروون و ساف کردنەوەی و بزار کردنی لە سیفەتە بەدە شەیتانی و ئاژەڵی یەکان ، تاقە ڕێباز « طریقة »ی بەرەو خوا

---

(٧) دەربارەی پەیدا بوونی ( تصوف ) ڕای جۆراو جۆر هەن بەڵام ڕاست ترینیان ئەوەیە کە ( تصوف ) واتە : خۆ ساف کردنەوە ، « ابو الفتح البستي »یش لەو بارەوە گوتوویەتی :

تخالف الناس في الصوفي واختلفوا
جهلا وظنوا انه مشتق من الصوف
ولست أمنح هذا الاسم الا فتى
صافى فصوفي حتى اسمي الصوفي

چوونو بەحوا گەیشتنو بۆ خوا یەکلا بوونەوە بێ(٨) ، حەتمەن نابێ تایبەت بێ بە دەستەیەکی دیاری کراوەوە ، چونکە وەک گوتمان بە خوا گەیشتنو خوا ناسیو بۆ خوا یەکلا بوونەوە ئامانجو مەبەستی هەرە بەرزو بالآی هەموو بڕوادارو موسولمانێکە ، کەواتە : ئەو ڕێبازەش کە مرۆڤ بەو ئامانجو مەبەستە بەرزو پیرۆزە دەگەیەنێ ، دەبێ شتێکی گشتی بێو هەموو بڕواداران تیدا هاوبەش بن •

هەڵبەتە بەڵگەش بۆ سەلماندنی ڕاستیو تەواویی ئەو ڕایەی خستمانە ڕوو زۆرو زەوەندن بەڵام دەرفەتی خستنە ڕووی هەموانمان نیەو ، چەند نموونەیەکیان لێ باس دەکەین :

خوای زانا فەرموویەتی :

« یا یها الذین آمنوا اذکروا الله ذکرا کثیرا ، وسبحوه بکرة واصیلا » الاحزاب ـ ٤١ ، ٤٢ •

واتە . ئەی بڕوادارینە یادی خوا بکەن یاد کردنێکی زۆر ، وە بەیانیانو ئێواران بە پاکی بگرن •

دیسان فەرموویەتی :

واذکر اسم ربك بکرة واصیلا » الدهر ـ ٢٥ •

واتە : وە ناوی پەروەردگارت یاد بکە بە یانیانو ئێواران •

وە فەرموویەتی :

---

(٨) لە پێشەکیو ڕێ خۆشکردنی ( گەورە ترین ڕاستی )دا ئەو باسە توێژراوەتەوە •

« فاذكروا الله قياما وقعودا وعلى جنوبكم ••• » النساء ـ ١٠٣ •

واته : جا به پێوەو بە دانیشتەوەو لەسەر تەنیشتتان یادی خـوا بکـەن •

وەك دەبینین خوای پەروەردگار ڕوو دەكاتە تێكڕای مسوڵمانانو فەرمانیان پێ دەكات كە یادی خوا بكەنو پاكیو بێ خەوشی بۆ بڕیار بدەن •

بەڵێ سەرەكی ترینو بنەڕەتی ترین خەسڵەی ئینسانی مسوڵمانو زەق ترین درووشمو نیشانە كە پێیەوە دەناسرێ بریتیە لە یادی خواو لەگەڵ خوا بوون ، چونكە بابای خواناسو مسوڵمان خوای لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێ « والذين آمنوا اشد حبا لله » البقرة ـ ١٦٥ • بێگومان ئینسان هەر شتێكیشی زۆر خۆشویست زۆر باسی دەكات : من احب شيئا اكثر من ذكره » رواه ابو نعيم والديلمي عن عائشـة مرفوعـا •

وە بابای خواناس لە هەموو كەس پتر شەرمو ڕێزو ترسی هەیە سەبارەت بە خوا « ولم يخش الا الله » التوبة ـ ١٨ •

دیسان ساف كردنەوەی دڵو خاوێن كردنەوەو بژاركردنی دەروون لە خووو حەسڵەتە شەیتانیو نازەلی یەكانو ، شوعلەوەر كردنی دڵ بە تیشكی خوا ناسیو ، ڕازاندنەوەی دەروون بە سیفەتە بەرزە خواییو ڕیشتەیەكان ئامانجی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام بووە : يتلوا عليهم آياته ويزكيهم » الجمعة ـ ٢ •

وە مایەی سەر فرازیو بەختەوەری ڕزگاریی هەموو ئینسانێكە :

ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها • قد افلح من زكاها ،
الشمس ـ ٧ ، ٨ ، ٩ •

واته : وه سوێند به نەفس‌و بەوەی ڕێکی خستوه ، جا هێزی تاوانباری‌و هێزی پارێزکاری فێر کرد ـ وتیدا بنیات نا ـ ، بێگومان ئەوەی پاکی بکاتەوه ـ له تاوان‌و خراپه‌و گەشه بە لایەنی چاکه خوازی‌ی بدات ـ ئەوه سەرفرازو ڕزگاره •

کەواته :

ئینسان بەبێ یادی خوا کردن‌و له خوا ترسان‌و خوا خۆشویستن‌و خۆ پاککردنەوه لـه خەسڵەته بەده‌کان‌و خۆ ڕازاندنەوه به خەسڵەته چاکه‌کان‌و ، هەڵبژاردنی دوارۆژو ، دنیا بەکەم گرتن ، به مسوڵمان‌و خواناس دانانرێ ، جا ئەوەی گوتمان پێی بگوترێ خۆ ساف کردنەوه « تصوف »یان پاککردنەوەی دەروون « تزكية النفس »یان پەروەردەکردن « التربية »یان خۆ پاککردنەوه‌و خۆ ڕازاندنەوه « التخلية والتحلية »یان خوا خۆشویستن « حب الله » •• هتد گرنگ نیه بەڵکو گرنگ ئـەو کاکڵ‌و تێوەڕۆکەیه کەخستمانه ڕووو شیمان کردەوه •

بەڵام دەبێ ئەوەشمان له بیر بێ ، که هەر چەنده ئینسان بەبێ ئەو لایـەنه ئیایی‌و مەعنەوی‌یەی باسمان کرد ، نابێته مسوڵمان‌و بـه خوا ناس دانانرێ ، بەڵام به تەنیش بەس نیه بۆ به مسوڵمان له قەڵەم درانی ئینسان ، چونکه لایەنی گۆڕین یەکێکه لەلایەنەکانی ئیسلام ، کەواته مرۆڤی خـوا ناس‌و مسوڵمان پێویسته وێڕای لایـەنی ناوبراو هەوڵی ئامکردن‌و لێ حاڵی بوونی لایەنەکانی دیکەی ئیسلامەتیش بدات‌و ،

شووری بەڕێوە بردنی وردو درستی بەرنامەی خوا بخوات ، لە چوار چێوەی نەفسی خۆیو خێزانیو کۆمەڵگاکەیدا •

**پێنجەم : مرۆڤی خوا لە یاد دەبێ چۆن بێ ؟!**

کەسانێک کە شارەزاییو زانیاری‌یەکی ڕاستو دروستیان دەربارەی خودی ئیسلام نیەو ، بەس لە ڕوانگەی ڕەفتاری هەڵەو واقیعی زیانی بێ سەردو بەرەی مسوڵمانانەوە تەماشای ئیسلام دەکەن ، پێیان وایە مرۆڤی خوا لەیاد « ذاکر » ، بابایەکە فڕی بەسەر دنیاوە نیەو ، مردە لۆخەو فەقیر حاڵو بێ ئاگایەو ، لەگەڵ قیامەتێ تێکەڵ بووەو ، ئاگای لەکەس نیەو هەقی بەسەر کەسەوە نیە !!

جا بێگومان ئێمە نکوولیمان لەوە نیە کە کەسانێکی وا هەن کە بەناهەق خۆیان ئاخنیوەتە نێو ڕیزی خوا لەیادانو خوا ناسانی ڕەسەنو ڕاستەقینەوە ، بەڵام ئەگەر بێینە سەر باری هەقو واقیع ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر پێیان بڵێین :

بابایەکی ڕاهیبو شوێن کەوتووی ئایینی شێوێنراوی مەسیحی ڕاست و چاکترە ، لەوەی کە بەشوێن کەوتووو گوێ لە مستی ئایینی ئیسلامیان لە قەڵەم بدەین •

چونکە ئایینی تیرو تەواوو دەستکاری نەکراوی ئیسلام قەت قەت ئەو جۆرە شوین کەوتوانە بەرهەم نایەنێو ، بەڕەفتارو ئاکاری نالەباری ئەو جۆرە کەسانەش قایل نیە ، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ناسو تێکۆشەر بێ پەردە فەرموویەتی :

« ان الرهبانية لم تكتب علينا » رواه الامام احمد في مسنده •

وانە : بێگومان دنیا نەویستیو گۆشە نشینی لە سەر ئێمە پێویست نەکراوە •

وە لە ڕاستیدا کەسێک نــە ڕێیەکی ڕاستەوە خوای ناسی بێو هەمیشە یادی بکاتو ، دڵی لە خۆشەویستیو عیشقو سامو ڕێزو هەیبەتی پڕ بووبێ ، هەوڵ دەدات هەرچی خوا پێی فەرمووەو لە سەری پێویست کردوە ، بێ سێو دوو جێ بەجێی بکات ، بەشکم هەرچی زیاتر خوای پەروەردگاری لە خۆی ڕازی بکات •

ئنجا کومانیشی تێدا نیە کــە ئەو شتانەی خوای کار بەجێ لــە ئاینو بەرنامەی خۆیدا لە سەر مرۆڤی مسوڵمانی پێویست کردوون ، بەس پەیوەندییان بەلایەنی گیانیو مەعنەوی یەوە نیەو وردو درشتی لایەنە جۆراو جۆرەکانی ژیانی تاکو کۆمەڵ دادەگرنو ، هیچ کونو کەلێنیان نەهێشتوونەوە کە مرۆڤ بەهەواو ئارەزووەکانی خۆی پڕیان بکاتەوە •

ئنجــا ئەگــەر : سەرنجیش بدەینــە مێژووی ژیانی خــوا ناسانی ڕاستەقینەی مسوڵمانیش دەبینین وێڕای بــەرەو خــوا چوونو عیشقو خۆشەویستیو پەرستن لــە هەموو بوارەکانی دیکەی ژیانیشدا بەس بەندەی خوا بوونو شوێن کــەوتووو گــەردن کــەچی ڕێو شــوێنی پێغەمبەری ( مصطفی ) بووون •

بەڵێ خوا ناسە ڕاستەقینەکان مەردی میحرابی پەرستنو ، مەیدانی جەنگ بوونو ، لە بواری عبادەتو بازاڕی سیاسەتدا کارامەو لێهاتوو بوونو ، یسکیان هەم لە تەقوادا دەبووە هەم لەغەزاداو ، بە خەم خواو خەڵکەوە بوونو ، دڵڕوونو بیر تیژ بوونو ، دنیاو دواڕۆژیان کردووتە

چەپکێنەو پێکەوەیان بەستووەو ، شتاقیان بۆ شتاقیان فەرامۆش نەکردوون .

کەواتە :

با واقیعی ناقۆڵاو نا بەرچاوو لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوی هەندێک کەسی بەناو سۆفی دواکەوتووو لاسا کەرەوەو حاڵی نەبووو بیر کورتو جەزبە گرتووو توند خووو تەنگە پرێسکەو زوو تووڕە بوو ، کە جۆرە ئیسلامێکی سەیرو نامۆو یەکلایەنەیەو سەر بەخۆیان پەیدا کردووەو کەسانێکی دڵساف و فەقیر حاڵو بێ هەواڵیان پێوە گەرمو گیرۆدە کردووەو بە ناهەق خۆیان بە شوێن کەوتووی شۆڕە سوارانی مەیدانی خوا ناسیی وەک : حەسەنی بەسرییو گەیلانیو غەززالیو شێخ جونەیدی بەغدایییو بەدەوییو ڕوفاعیو .. هتد لە قەڵەم داوە ئێمە سەبارەت بە خوا ناسانی ڕاستەقینەو ( تصوف )ی ڕەسەن بێ باوەڕو دڕدۆنگ نەکاتو ، قسەی هەڵەی « شەلم کوێرم کەس نابوێرم » نەکەینە یاسا !!

بەڵێ هەر وەک چۆن پیاو هەنو پیاوێلکەش هەن ، سۆفیش هەن سۆفیلکەش هەن ، سۆفیو خوا ناسی ڕاستەقینەش ئەو مسوڵمانە ڕاستەقینەیە ، کە هێندە لەگەڵ خوا تێکەڵ بووەو بە ڕاددەیەک خۆشی دەوێو سامی لێ دەکات ، کە تەنانەت سەرە دەرزییەکیش لە ئاینی خوا بەکەم ناگرێو هیچی لێ پشت گوێ ناخاتو ، گچکەترین شتی لێ بەزایە نادات ، چ جای ئەوەی لووتکەی هەرە بەرزی ئیسلام « جهاد » پشت گوێ بخاتو ، بێنێ قیڵ لە خۆی خەلکی بکاتو چەمکی بەرفراوانی

تێکۆشان » لە جوغزی پاککردنەوەی دەروون « تزکیة النفس »دا کورت هەڵێنێ‌و ، هەرچی لە ڕچەی ویش دەرچوو بێ سووچ‌و هۆ بێ بوغزێنێ !!

کەواتە :

پوختەی قسان ئەوەیە کە ئەو یادی خوداو « تصوف »ەی پشت لە ( جهاد )دەکاو ، ڕابەرو ڕێدین سپیانی لە ژێر باڵی طاغووت‌و ستەمکاراندا دەژین ، سوور سوور بزانن « تصوف »ێکی ناڕەسەن‌و بێ خێرو بێ هێزو پێزە ، چونکە یادی خودای ڕاست‌و لەگەڵ خوا بوون‌و خوا خۆشویستنی تەواو ، وا لە ئینسان دەکات کە بۆ خوا حاوێن‌و یەکلا بێتەوەو بەشی نەفسی خۆشی پێوە نەمێنێ ، چ جای ببێتە کۆیلەو خزمەتکارو پاڵپشتی بابیەکی طاغووت‌و دنیا خۆرو بە زەبرو زۆر !! .

**شەشەم : ئەم کتێبە :**

خوێنەری خۆشەویست !

ئەم کتێبە بەرگی یەکەمە لە کتێبی « یادی خودا » جا لەم بەرگەدا چەند باسێکی جۆراو جۆر هەن کە تێکڕایان لە جوغزی گرنگی‌و پێویستی‌و کاریگەریی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا کۆ دەبنەوە .

وە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەش خوا پشتیوان بێ تەرخان کراوە بۆ ڕوونکردنەوەی شێوەو چۆنیەتی خوا یادکردن بە پێی ڕێ‌و شوێن‌و سوننەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم .

ـ خواش داوا کارم ئەم کارەم لێ وەرگرێو گەلەکەمی پێ سوود مەند بکاتو ، کەلێنێکیش لە کتێبخانەی نەدارو کەم دەرامەتی ـ کوردی پڕ وەکات .

دێی « سەرسیان »

ڕەمەزانی ساڵی ١٤٠٥ی کۆچی .

# پێناسەی یادی خودا (الذکر)

١ ـ خاوەنی کتێبی [ مختار الصحاح ] سەبارەت بە وشەی [ ذکر ] کوتوویەتی : [ الذکر والذکری والذاکرة : ضـد النسیان ][1] واتە : هەر کام لە [ ذکر وذکری وذکرة ] دژی لە بیر چوونەوەیە، کەواتە : وشەی [ ذکر ] یانی : وەبیر هاتنەوە •

٢ ـ « راغب الاصفهاني » دەربارەی وشەی [ ذکر ] گوتوویەتی : [ وتارة یقـال لحضور الشيء القلب او القول • ولذلك قیل : الذکر ذکران ذکر بالقلب وذکر باللسان ، وکل واحـد منهمـا ضربان ، ذکر عن نسیان وذکر لا عن نسیان ـ ][2] واتە : وە هەندێك جاران [ ذکر ] بەشتێك دەگوترێ کە لە دڵ یان لەزماندا ئامادە بێت ، بۆیە گوتراوە : یاد کردن دوو جۆرە ، یادی بەدڵو یادی بەزمان ، هەرکامێکیشیان دوو جۆرە ، یاد کردن دوای لە بیر چوونەوە ، وە یاد کردن بەبێ لە بیر چوونەوە •
کەواتە : وشەی [ ذکر ]یانی یاد کردنو باس کردنی شتێك بە دڵ یان بە زمان •

٣ ـ « زمخشري » دەربارەی هەمان وشە دەڵێ : [ •• واجعله مني علی ذکر ، اي لا انساه •• ][3] واتە : وام لێ بکە فڵانە شتم لە یاد

(١) مختار الصحاح ط١ ـ ١٩٢٦ ـ ص٢٢١ •
(٢) معجم مفردات الفاظ القرآن ص١٨١ •
(٣) أساس البلاغة ، ص٥٠٤ ، جارالله زمخشري •

نەچێ ، کەواتە : [ ذکر ] دژی لە یاد چوونەوەو لە بیر چوونەوەیە •

وەک دیتمان وشەی [ ذکر ] لە بنچینەی زماندا ، واتە : باس کردنو یاد کردنو وەبیر هاتنەوەی شتێك ، بەڵام دوایی ئیسلام ئەم وشەیەی لە زمانی عارەبی خواستو چەمكو مەبەستێكی سەر بەخۆی تایبەتیی پێ بەخشی ئەویش بریتیە لە « یادی خواو باس کردنی بەدڵ یان بەزمان یان بە هەردووکیان » •

واتە : ئیسلام هەمان ڕەفتار کە لەگەڵ : [ صلاة[4] وصوم[5] وزکاة[6] و حج[7] و •• هتد ]ی داکرد لەگەڵ وشەی [ ذکر ]یشیدا کردو کردیە زاراوەو درووشمێکی ئیسلامی •

مادام وابێ ئێستا دەتوانین لە بەر تیشکی ئایەتەکانی قورئانی بەرێزو دەقەکانی سوننەتی بەڕێزدا ئاوا پێناسەی [ ذکر ] بکەین : [ « ذکر » بریتیە لە پاكو بێگەردی دەربڕینو بەگەورە گرتنو بە بەرز گرتنو سوپاسو ستایش کردنی خواو باس کردنو دەرخستنی

(٤) ( صلاة ) لە بنەڕەتدا یانی پاڕانەوەو ستایش • معجم مفردات الفاظ القرآن ص٢٩٣ •

(٥) ( صوم ) لە ئەسڵدا یانی خۆ گرتنەوە لە هەموو شتێك • معجم مفردات •• ص٢٩٨ •

(٦) ( زکاة ) لە بنەڕەتدا یانی گەشە کردنو فراژوو بوون • اساس البلاغة ص٢٧٣ •

(٧) ( حج ) لە بنچینەدا یانی نیازو مەبەستی سەردان • معجم مفردات •• ص١٠٦ •

ناوو سیفەتە تەواوەکانی بە دڵو زمان • ]

ئنجا با سەرنجێکیش لە قسەی زانایان بدەین لەو بارەوە :

١ ـ [ سعید بن جبیر ] گوتوویەتی : [ هەر کەسێك لە فەرمانبەریو ڕەزامەندی خوادا ئیش بکات ئەوە یادی خوای کردوە ] هەڵبەتە لێرەدا وشەی ( ذکر ) بە ماناو چەمکی خۆی پتری دراوەتێ •

٢ ـ [ عطاء بن رباح ] دەڵێت : [ کۆڕی [ ذکر ] بریتیە لە کۆڕی باسکردنی حەڵاڵو حەرام ، چۆن دەکڕیو چۆن دەفرۆشی ، وە چۆن نوێژو ڕۆژوو بە جێ دێنی ، وە چۆن ژنێ مارە دەکەیو تەڵاقی دەدەی ، وە چۆن حەجێ دەکەیو وێنەی ئەمانە • ]

٣ ـ [ قرطبي ] گوتوویەتی : [ کۆڕی ] [ ذکر ] واتە : کۆڕی زانیاریو ئامۆژگاری ، ئەو کۆڕانەی کەتێیان دا باسی قورئانو فەرموودەی پێغەمبەرو ، هەواڵی خواناسە پێشینەکانو ، قسەی پێشەوا دنیا نەویستەکان دەکرێ •• ] •

٤ ـ [ ابن الصلاح الشهرزوري ] دەڵێت : [ هەر کەسێك لە سەر گوتنی ئەو جۆرە ( ذکر )و دوعایانە بەردەوام بێت کە بۆ بەیانیانو ئێوارانو هەموو دەمو کاتو حاڵەتە جۆراو جۆرەکانی ژیان دیاری کراون ئەوە دەچێتە ڕیزی ئەوانەی کەخوا باسی کردوون بە [ الذاکرین الله کثیرا والذاکرات ] • ]

٥ ـ [ مجاهد ] دەڵێت : [ مرۆڤ ناچێتە ڕیزی پیاوانو ئافرەتانی زۆر خوا لەیاد [ الذاکرین الله کثیرا والذاکرات ] هەتا هەموو دەمێ چ بەپێوە بێو چ بەدانیشتنەوە بێو چ بەڕاکشانەوە یادی خوا

نەکات • ][(٨)

ئیسلامی زانایانی خواناس گوتوویانە :

[ ان الذکر علی سبعة انحـاء : فذکر العینین : البکاء ، وذکـر الأذنین : الاصغاء • وذکر اللسان : الثناء ، وذکر الیدین : العطـاء • وذکر البدن : الوفاء ، وذکر القلب : التسلیم والرضاء • وذکر الروح : الخوف والرجاء • ]

واتـە :

یادی خودا حەوت جۆری هەیە :

یاد کردنی چاوان : گریانە ، وەیاد کـردنی گوێیان : گوێ گرتنـە ، وەیاد کردنی زمان : ستایش کردنە ، وەیاد کردنی دەستان : دەست بەخشینە ، وە یاد کردنی جەستە ، وەفاو بەنمـەکی یە ، وەیاد کردنی دڵ . گەردن کەچی و ڕازی بوونە ، وە یاد کردنی گیان ترس و ئومێدە(٩) •



---

(٨) ئـەو پێنج پێناسانەم لـە ( فقـه السـنة ) ج١ ص٥٨٠ ـ ٥٨١ وەرگرت •

(٨) ریاض الجنة ، ص١٤٠ ، عبدالحمید کشك ( الخطیب ) •

# بەرزی پلەو پایەی یادی خودا

وشەی [ ذکر ] بە هەموو ڕێزگە ( صیغە )کانی‌یەوە [٢٩٧] جار لە قورئانی‌دا دووبارە کراوەتەوە(١) ، هەڵبەتە ئەو دیاردەی دووبارە بوونەوەی وشەی [ ذکر ] بەم ڕێژەیە ، ئەگەر هیچی لێ وەفامرێ ئەوەیە ، کە یادی خودا لە ئیسلامدا پلەو پایەیەکی هەرە بەرزو باڵای هەیە ، چونکە قورئانی قسە ئەجێ گوتاری خوایەو هەموو پێتو وشەو ڕستەکانی بە تەرازووی زانیاریو کار بەجێیی خوا کێشراونو ڕۆنراون(٢) ، ئنجا هەڵبەتە زۆر دوو بارە کردنەوەی وشەیەک یان مەبەستێک نەوە دەگەیەنێ ، خەخوای بەخشندە بۆیە پێگیری لە سەر کردوە ، چونکە دیارە بە ئەندازەو ڕێژەی دووبارە کرانەوەی گرنگو گەورەو کاریگەرە •

بێگومان ئەگەر سەرنجێکی قورئانو سوننەتیش بدەین گەلێک ئایەتو فەرموودە دەبنە بەڵگەو شایەدی ڕاستی ئەو قسەیەمان •

آ ـ چەند نموونەیەک لەقورئان :

١ ـ خوای بەرزو بێ هاوتا فەرموویەتی : [ فَأذكروني أذكركم •• ]

---

(١) المعجم المفهرس لالفاظ القرآن الكريم محمد فؤاد عبدالباقي ـ ص٢٧٠ الى ص٢٧٥ •

(٢) « الله الذي انزل الكتاب بالحق والميزان » الشورى ـ ١٧ •
واتە : ئەو خوایەی کە کتێبی بە حەقو بەتەرازوو ناردوە !

البقرة ـ ١٥٢ •

واتە : ئەی بەندەکانم ـ یادم بکەن ، یادتان دەکەم !

بێگومان هەر کەسێکیش خوای بەخشندە یادی بکاو مشووری لێ بخوات ئەوە گرۆی خۆی بردۆتەوەو لەخەم ڕەخسیوە •

٣ ـ سەبارەت بە بەرزی پلەو پایەی [ ذکر ] دەفەرموێ :

[ اتل ما اوحي اليك من الكتاب واقم الصلوة • ان الصلوة تنهى عن الفحشاء والمنكر ، ولذكر الله اكبر والله يعلم ما تصنعون • ]

العنكبوت ـ ٤٥ •

واتـە : ئەوەی لـە قورئانێ بۆت نێرراوە بیخوێنەوە ، وە نوێژی بکەو ، نوێژ پێشگیری لە مرۆڤ دەکات[٢] لە ئاقار هەر جۆرە کارێکی بەدو ناڕەواو هـەر شتێك بەپێی بەرنامەی خواو ژیری ساغ ناپەسند بێت ، بـەڵام یادی خودا گەورەترە ـ لەوانـەی ڕابردن ـ وە خواش دەزانێ چ دەکەن •

لێرەدا دەبینین خوای زانا یاد کردنی لـە قورئان خوێندنو نوێژ بەگەورەتر داناوە ! هەڵبەتە گەورەترە چونکە :

یەکەم : نوێژو قورئان خوێندنیش هەر بەمەبەستی هێنانەدی یادی

---

(٢) عن ابن عباس قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم ( من لم تنهه صلاته عن الفحشاء والمنكر لم يزدد بها من الله الا بعدا • ) رواه ابن كثير والطبراني •

واتە : هەر کەسێك نوێژەکەی لە بەد ڕەفتاریو خراپە نەیگێڕێتەوە هەر زیاتر پێی لە خوا دوور دەکەوێتەوە • تفسير ابن كثير ج٣ ص٤١٤ •

خوا ئەنجام دەدرێن : [ وأقم الصلاة لذكري ] طه ـ ١٤ ٠

دووەم : نوێژو قورئان خوێندن دوو جۆرن لە جۆرەکانی یادی حـودا ٠

بێگومان ڕستەی [ ولذكر الله أكبر ] بێجگە لەو مەبەستەی گوتمان، مەبەستێکی دیکەش هەڵدەگرێ ؛ واتـە : وە یاد کردنی خـوا بۆ ئێوە بۆوی ، یان : وەیادی خوا بەهۆی بەزەیی نواندنی لەگەڵتان ، گەورەترە لە یاد کردنی ئێوە بە هۆی فەرمانبەری کردنتان بۆ وی ٠

ئەم جۆرە لێکدانەوەیەش هەڵبژێرراوی ( طبري )یەو (ابن كثير)و ( بيضاوي )یش پەسندیان کردوە[٣] ٠ ئنجا ئەگەر ئەم مانایەش لە بەر چاو بگیرێ ، ئەوە هیچ لـەو مەبەستەی ئێمە ناگۆڕێ ، چونکە بـەڵێ بەڕاستی یاد کردنی خوا بۆ ئێمە گەورە ترە لە نی ئێمە بۆ وی ، بەڵام هەتا ئێمـە یادی وی نەکەین ، ئەو یادی ئێمـە ناکات ، [ فاذكروني أذكركم ] البقرة ـ ١٥٢ ٠

٣ ـ ئەجێیەکی دیکەدا فەرموویەتی : [ واذكر ربك في نفسك تضرعا وخيفة ودون الجهر من القول ، بالغـدو والآصال ولا تكن من الغافلين ] الأعراف ـ ٢٠٥ ٠

یانی : وە یادی پەروەردگارت بکە بە دڵ ، حاڵەتی گەردن کەچیو ترسان بـە خۆوە بگـرە ، وە دەنگت بـەرز مەکەوە[٤] ، بـەیانیانو

---

(٣) بڕوانە تەفسیری ( ابن كثير ) ج٣ ص٤١٥ ، وەتەفسیری بیضاوي ج٢ ص٢١١ ٠

(٤) هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن : مەبەست لە وشەی ( واذكر ) لەم ئایەتەدا قورئان خوێندنی نێو نوێژە ، بۆیەش فەرمانی کردوە

ئێواران(٥) ـ یادی خوابکەن و لەوانە مەبە کە بێ ئاگان •

٤ ـ لە سوێنێکی دیکەدا فەرموویەتی : [ یا أیها الذین آمنوا اذکروا الله ذکرا کثیرا وسبحوه بکرة وأصیلا ] الاحزاب ـ ٤١ •

واتە : هۆ بڕوا دارینە ! بەیاد کردنێکی زۆر یادی خوا بکەن ، وە بەیانیان و ئێواران پاکی و بێگەردی بۆ بڕیار بدەن •

٥ ـ دیسان فەرموویەتی : [ ان المسلمین والمسلمات ••• والذاکرین الله کثیرا والذاکرات أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظیما • ] الاحزاب ـ ٣٥ •

واتە : پیاوانی مسوڵمان و ئافرەتانی مسوڵمان ••• وە پیاوان و ئافرەتانی زۆر خوا لەیاد ، خوا بێبوردن و پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادە کردوون •

ب : چەند نموونەیەک لە سوننەت :

١ ـ عن ابي سعید الخدري ، وابي هریرة ان رسول الله صلی الله علیه وسلم قال : لا یقعد قوم یذکرون الله تعالی الا حفتهم الملائکة وغشیتهم الرحمة ، ونزلت علیهم السکینة وذکرهم الله تعالی فیمن عنده • ] رواه مسلم •

واتە :

هەر کۆمەڵێک پێکەوە دانیشن یادی خوای بەرز بکەن ، ئەوە

---

کە دەنگ بەرز نەکرێتەوە ، چونکە کافرەکان پێی قەڵس دەبوون •
ابن کثیر ج٢ ص٢٨١ •

(٥) دەگوێجێ بڵێین : مەبەست لە بەیانیان و ئێواران هەموو دەم و کاتێکە بەڵام بۆیە بەس بەیانیان و ئێواران باسکراون چونکە سەرو بنی شەو و ڕۆژانن •

فریشته دەوریان دەدەن‌و ، بەزەیی خوا دایان دەپۆشێ‌و ، ئارامی‌یان بە سەردا دەباریت ، وەخوای بەرزو بێ‌هاوتا لە کن ئەو فریشتانەی لێی نیزیکن(٦) باسیان دەکات •

٢ ـ عن ابي موسى الاشعري رضي الله عنه عن النبي صلى الله عليه وسلم قال : [ مثل الذي يذكر ربه والذي لا يذكره مثل الحي والميت • ] رواه البخاري •

واتە : وێنەی ئەو کەسەی یادی خوا دەکات‌و ئەوەی یادی ناکات ، وەک مردووو زیندوو وایە •

٣ ـ عن ابي الدرداء رضي الله عنه قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم . [ ألا انبئكم بخير اعمالكم وازكاها عند مليككم ، وارفعها في درجاتكم ، وخير لكم من انفاق الذهب والورق ، وخير لكم من ان تلقوا عدوكم فتضربوا اعناقهم ؟! قالوا : بلى قال : ذكر الله • ] رواه الترمذي واحمد ، وقال الحاكم في مستدركه : صحيح الاسناد •

واتە :

ئایا هەواڵتان پێ بدەم بە باشترین کردەوەتان ، وەپاکترینی لە کن گەورەو سەرۆکتان ـ خوای بێ‌هاوتا ـ وە بەرز ترینی لە پلەو پایەی کردەوەکانتاندا ، وە چاکتر بێ بۆتان لە بەخشینی زێرو زیو ، وەچاکتر بێ بۆوە لەوەی کە بگەنە دوژمنتان‌و لە گەردنیان بدەن ؟!

گوتیان : با ، گوتی : یادی خودا •

---

(٦) لێرەدا مەبەست نیزیکی مەعنەوی‌یە •

٤ ـ عن ابن عمر قال : قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : [ اذا مررتم برياض الجنه فارتعوا ، قالوا وما رياض الجنة يا رسول الله ؟! قال حلق الذكر ، فان لله تعالى سيارات من الملائكة يطلبون حلق الذكر ، فان أتوا عليهم حفوا بهم • ] رواه الترمذي •

واتـه :

ئەگەر بەلای باغەکانی بەهەشتدا ڕابردن ، لەزەت وەرگرن ، گوتیان : باغەکانی بەهەشت چن ئەی پێغەمبەری خوا ؟! گوتی کۆڕەکانی یادی خوان ، چونکە خوا چەند فریشتەیەکی گەڕۆکی هەن بە دوای کۆڕەکانی یادی خوادا دەگەڕێن • جا هەر کاتێک تووشیان بوون دەوریان دەدەن •

٥ ـ وقال رجل يا رسول الله ان شرائع الاسلام قد كثرت علي فأخبرني بشيء أتشبث به ، قال : [ لا يزال لسانك رطبا من ذكر الله • ] رواه الترمذي •

واتـه :

پیاوێک گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! یاساکانی ئیسلامم لە سەر شانی زۆر بوون ، جا هەواڵم بدەیە ـ واتە فەرمانم پێبکە ـ بەشتێک کە هەمیشە بیکرم ، گوتی ، با بەردەوام زمانت بە یادی خوا تەڕبێ •

٦ ـ عن أبي هريرة عن النبي صلى الله عليه وسلم قال : [ سبق المفردون قالوا : وما المفردون يا رسول الله ؟! قال : الذاكرون الله كثيرا والذاكرات • ] رواه مسلم والترمذي •

واتـه :

تاق بووەوەکان[٧] پێش ـ هەموو خەڵکی ـ کەوتوون ، گوتیان : ئـەی پێغەمبەری خوا تاق بووەوەکان کێن ؟! گوتی : پیاوانو ئافرەتانی زۆر خوا لە یادن .

٧ ـ روی ابن جریر عن ابن عباس انه قال : [ لا یفرض الله علی عباده فریضة الا جعل لها جزاء معلوما ، ثم عذر اهلها في حال العذر غیر الذکر . فان الله لم یجعل له حدا ینتهي الیه . ولم یعذر احدا في ترکه الا مغلوبا علی عقله فقال : [ فاذکروا الله قیاما وقعودا وعلی جنوبکم ، اي باللیل والنهار ، وفي السفر والحضر والغنی والفقر ، والسقم والصحة ، والسر والعلانیه وعلی کل حال ] . تفسیر الجلالین ص ١٢٠ ـ ط ٢ مکتبة النهضه .

واتـه :

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویەتی : خوا هیچ ئەرکێکی لە سەر بەندەکانی پێویست نەکردوە کە پاداشتێکی دیاری کراوی بۆ دانە نابێ ، ئنجا لـە کاتی تێگیراوی دا عوزری لێ قبووڵ کردوون ، بێجگە لە یادی خودا ، چونکە خوا سنوورێکی بۆ دانەناوە کە لەوێ کۆتایی پێبێ ، وە عوزری لە کەس وەرنەگرتوە کە وازی لێ بێنێ مەگەر بابایەکی بێ هۆش ، جا کەفەرموویەتی : « یادی خـوا بکەن بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لە سەر تەنیشتتان ، یانی : بـە شەوێو بەڕۆژێ ، لە وشکانیو لە دەریا ، لە سەفەرێو لە غەیری سەفەرێ ،

(٧) چونکـە بەهۆی زۆر یاد کردنی خـوا لـە خەڵکی جوێ بوونەوەو تاقبوونەوە . تاج الاصول ج٥ ص٨٨ .

بــه دەوڵەمەندیو بەنەداری ، بە نەساغیو بە ساغی ، بــه پەنهانیو بەئاشکرا ، وە لەهەموو حاڵێکدا •

بەڵێ خوێنەری بەڕێزو سەنگینم :

ئەوەیە پلــەو پایــەی « ذکر »یاد کردنی خودا لــه ڕوانگــەی ئیسلامەوە ، وەك دەبینین یادی خــوا لــەژیانی مرۆڤی مسوڵماندا بــه گەورە ترین درووشمی ژیانیو بنەڕەتی ترینو بنچینەیی ترین بەردی بناغــەی کۆشکی بیرو باوەڕی دادەنرێو ، ســەرەکی ترین خەسڵەتی کەسایەتیی پێك دەهێنێ •

بەڵام ئێستا ڕەنگە کەسانێك کە لە ئیسلامەتی بێ هەواڵنو ، بــە ســەر پێیی‌وسادەیی سەرنجی شتی دەدەن ، دوو پرسیار خوتخوتەی دڵیان بدەن :

یەکەم : ئەو هەموو دەقانەی کە سەبارەت بە بەرزی پلەو پایەی یادی خــوا باسکران ، دژایەتی‌یان هــەیە لەگــەڵ خەباتو تێکۆشــان ( جهاد )دا ، چونکە ئامانجی مسوڵمانەتیو خــوا پەرستی ، وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو بەهەشتی بەرینە ، جا مادام لە ڕێی خوا یاد کردنەوە ئەو ئامانجە دەستگیر بێ ، چ حــەوجێ بە جیهادو تێکۆشان دەکات ؟! •

دووەم : ئەگەر ڕاست بێ یادی خودا هێندە گرنگو کاریگەر بێت ، کەواتە : ڕاست ترینو تەواو ترین شێوەی ئیسلام بەڕێوە بردن ، بریتیە لە سۆفیایەتی [8] •

---

(٨) لە نێو کورددا بێجگە لە زاراوەی ( سۆفی ) ( درویش )یش بەکار

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا دەڵێین :

ئەخێر وانیە ، لە ڕاستیدا هیچ جۆرە دژایەتی‌و پێکەوە نە سازانێک لە نێوان یادی خواو جیهادو تێکۆشاندا نیە ، چونکە هەر کام لە یادی خواو جیهاد ، تەواو کەری یەکترن ، ڕوونتر بڵێین : جیهادو خەبات کردن لە پێناوی خوا لە خەڵکدا ، ئەنجامی سروشتی یادی خواو پەیوەندی هەبوونە لەگەڵ خوادا ، بەڵێ لە ڕاستیدا بەس مرۆڤێک دەتوانێ لە ڕێی خوادا [ ڕێی خوا هەموو کاتێک بریتیە لە خزمەت کردنی خەڵک ، چونکە بەرنامەی خوا بۆیە نێرراوە کە لە نێو خەڵکیدا بەڕێوە ببرێ ، بەڕێوە بردنی بەرنامەی خواش هەموو دەمێ سوودو بەرژەوەندی خەڵکی تێدایە ] جیهاد بکات ، کە دایم‌و دەرەم خوای لە یاد بێ‌و هەست بە چاودێری‌ی بکات ، چونکە ئەو یاد کردن ( ذکـر )ە کەنیشانەی هەبوونی پەیوەندی‌یەکی بەتین‌و پتەوە ، لە نێوان خـواو بەندەدا ، هاندەرو پاڵنەری مرۆڤە بۆ نواندنی چالاکی‌و تێکۆشان لە پێناوی ئـەو خوایەدا کە هەمیشە لە یادی‌یەتی ، لێرەدا بەوەندە واز دێنین چونکە باسێکی تایبەتی تەرخان کراوە ، بۆ توێژینەوەی ئەم مەسەلەیە بەناوی [ پەیوەندی نێوان یادی خوداو جیهاد ] •

وە لە وەڵامی دووەمیشدا دەڵێین :

١ ـ چەمک‌و مەبەستی زاراوەی سۆفیایەتی ( التصوف ) لەگەڵ

---

دێ ، هەرچەندە لە ڕاستیدا هەر یەکن چونکە دروێش بەو کەسە دەڵێن کـە زیاتر ئاشکرا یادی خـوا بکـات ، بـەڵام سۆفی بـە سێچەوانەوە ، بە هەر حاڵ لەبنەڕەتدا وشەی [ صوفي ] بۆ سۆفی‌و دروێش بە کار هێنراوە بێ جیاوازی •

ـەو واقیعەی کە ئێستا ـ لەجیهانی ئیسلامدا بـە گشتیو کوردستاندا بەتایبەتی ـ بە ناوی سۆفیایەتیو درۆیشایەتی‌یەوە دەبینرێ ، هێندەی هەقو ناهەق لێك دوورن ـ بێجگە لە چەند حاڵەتێکی دەگمەن ـ •

٢ ـ بە هیچ ڕەنگێك دروست نیە بڵێین سۆفیایەتی شێوەیەکە لە شێوەکانی بەڕێوەبردنی ئیسلام ، چونکە تەنیا یەك ئیسلامو یەك شێوە بەڕێوەبردنی ئیسلام هەیە ، کە بریتیە لە ڕێبازی قورئانو سوننەت ، ئەوە لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە سۆفیایەتی بریتی نیە لە جۆرە ئیسلامێکی تایبەتی ، بەڵکو سۆفیابەتی بریتی‌یە لە لایەنێك لەلایەنەکانی ئیسلام کە لایەنی گیانیو پەروەردە کردنە ، هەڵبەتە ئەویش بەمەرجێك کە لە شیرازەی قورئانو سوننەت نەچێتە دەرێ ، دەنا بە شتێکی نامۆو دیاردەیەکی نائیسلامی دادەنرێ •

٣ ـ یادی خوا شتێك نیە بەس لە سەر سۆفی‌یەکان تاپۆ کرابێ بەڵکو درووشمێکی ئیسلامی‌یەو پێویستە هەموو خۆ بە موسوڵمان زانێك بەشکی تێیدا هەبێ •

٤ ـ هەر چەند وشەی ( صۆفی ) لە ڕابردوودداو ئێستاش بە چەند کەسێکی تایبەتی گوتراوە ، بـەڵام لە ڕاستی‌دا هـەر کام لـە موسوڵمانە ڕاستەقینەکانی ڕابردووو ئێستاش بەشکیان لـە صۆفیایـەتی‌دا هـەبووەو هەیە ، چونکـە ( تصوف ) کە بریتیە لە جیهادی دەروونیو خـۆ پاك کردنـەوەو دڵـساف کردنـەوە خـەسڵەتێکی بنـەڕەتی‌یە لـە هەموو موسوڵمانێکدا ، بەڵام مەرج ئەوەیە موسوڵمان بەس صۆفی نەبێت ، بەڵکو هەم صۆفی بێ ، هەم تێکۆشەر بێ ، هەم سیاسی‌بێ ، هەم زانابێ •• هتد ، بەواتایـەکی دی مەرج ئـەوەیە مرۆڤ صۆفیایـەتی‌یەکی ڕاستەقینـەی

ئیسلامی بگرێتەبەر ، نەک صۆفیایەتی یەکی لەگەڵ ئیسلامدا نەگونجاوی ئێشک ، کە لە جیاتی خەڵک هاندان بۆ خەبات و تێکۆشان بەنجیان دەکاو دەیان مرێنێ و .

لە وەڵامی ئەم پرسیارەش دا بەوەندە واز دێنین چونکە لە کتێبی [ سۆزی نەتەوایەتی ]دا کە ئەڵقەی چوارەمی زنجیرەی : دەبەرێک ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکانە ، تۆزێک زیاتر ئەم مەسەلەیەمان شی کردۆتەوەو خوێنەر حەواڵەی وێ دەکەین(٩) .



---

(٩) هەروەها لە پێشەکی و ڕێ خۆشکردنی کتێبی « گەورە ترین ڕاستی »دا ، چەند باسێکی خەست و خۆڵ لەو بارەوە نووسراون ، سەرەڕای ئەوەی کە لە پێشەکی ئەم بەرگەدا چەند خاڵێکی گرنگمان لەو بارەوە حستوونە ڕوو .

# ڕوون کردنەوەی دەوری یادی خوا

## لە ژیانی مرۆڤدا

خوای بێ وێنە زۆر جاران بۆ ڕوون کردنەوەی گەلێک مەبەستان لە قورئانیدا وێنان دێنێتەوە ، چونکە وێنە هێنانەوە یەکجار کاریگەرە لە دەرخستنی مەبەستو ئاشکرا کردنیدا •

جا ئێمەش لێرەدا بۆ ڕوون بوونەوەو ئاوەلا کردنەوەی مەبەست چەند وێنەیەک دێنینەوە •

**وێنەی یەکەم :**

دەوری ڤیتامین لە ژیانی جەستەیی مرۆڤدا :

[ ڤیتامینەکان ] چەند ماددەیەکی کیمیایی زۆر چالاکو کاریگەرنو زۆر بایەخدارن ، چونکە ڕێ ڕوونی هەموو کارەنجام ( تفاعل )ە کیمیاییە زیندەوەرییەکان دەکەن •• بەڵێ ڤیتامین دەورێکی سەرەکیو گرنگ دەبینێ لە جێ بەجێ کردنی خواردندا ، چ لە گیاندارانو چ لەمرۆڤدا هەر لە میکرۆبەوە بیگرە هەتا فیل •

کەوانە ئەرکی دیاری کراوی ڤیتامینەکان بریتیە لە ڕێکخستنی گۆڕانکارییەکانی خۆراکو ، بارمەتی ڕاپازینو کۆکردنەوەی وزەو تنی خۆراک دەداتو لە چەند جێیەکی تایبەتی ئێو لەشدا پاشەکەوتی

دەکات ، هەتا کاتی پێویستی[١] .

جا بێگومان ڤیتامینێک ئەو هەموو گرنگییەی هەبێو هێندە کاریگەر بێت ، دیارە دەبێ لە دەمی نەبوونی یان کەم بوونیدا ، لەش تووشی داگوزووریو تەنگو چەلەمە ببێ ، هەڵبەتە ڕاستە چونکە زانایان پاش لێکۆڵینەوەی زۆر بۆیان ڕوون بۆوە ، کە کەم بوون یان نەمانی هەر کام لە ڤیتامینەکان پاشەوارێکی خراپ لە جەستەی مرۆڤدا پەیدا دەکات .

ئێستاش بۆ نموونە ئەنجامی کەمبوونو نەمانی هەندێک لە ڤیتامینەکان دەخەینە ڕوو[٢] .

| جۆری ڤیتامین | کەم بوونی یان نەبوونی دەبێتە هۆی |
|---|---|
| ڤ A | چاو وشک هەڵگەڕانو سووتانەوەو کێم کردنیو ، شەو کوێری . |
| ڤ ب 1 | ئێشانی دەمارەکانو بێ هێزیو ئیفلیجیو خواردن پێ نەخورانو دڵە تەپە . |
| ڤ ب 2 | نەمانی گوڕوتینو زوو پیر بوون . |
| ڤ ب 3 | سەر ژووتانەوە . |
| ڤ ب 5 | حواردن پێ نەحوران ، دابەزینی ئاستی بیرو |

(١) الغذاء لا الدواء ص٥١٨ ، ٥١٩ ، الدكتور : صبري القباني .
وه ( دائرة المعارف زرين ) م. آدينفر ص٨٩٣ .

(٢) سەرچاوەی پێشوو ص٥٢٤ تاکو ٥٣٦ . وه ٨٩٤ تا ٨٩٥ .

هۆش زمان قەڵش قەڵش بوونو کێم کردن ، لێو قەڵشینو گەروو وشک بوون ، ڕشانەوەو زگ چوون ، دوایی سەردەکێشێ بۆ تێکچوونو شێت بوون •

ڤ C — نەخۆشی ئەسکەربووت ، کە نیشانەکانی بریتین لە خوێن بەربوونی پووکو جێیەکانی تری پێست بە ڕووشانێکی کەم ، ددان کلۆر بوون ، زەین کوێری ، لاوازیو بێ هێزی ، تێکچوونی کارو باری هەرس •

ڤ D — گێڕی ، ددان کلۆری ، بێ هێزی •

ڤ K — خوێن نەگیرسانەوە ، چونکە ئەم دەبێتە هۆی مەیانەنی •

کەواتە : ئەگەر بەگشتی سەیری ڤیتامین بکەین دەبینین نەبوونی یان کەم بوونی دەبێتە هۆی تێکچوونو لە بەرێک هەڵوەشانی جەستەی مرۆڤ ، لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە ، کە کەسێک بیەوێ تەندروست بێو لەش ساغی خۆی بپارێزێ پێویستە هەوڵ بدات ئەو خواردنو خواردنەوەیەی کە دەیخوات هەموو ئەو ڤیتامینانەی تێدابن کە بەنەبوونیان زیان ناچێتە سەرێ •

واتە : مەسەلە بەس گەدە تێر کردن نیەو هیچی دی ، بەڵکو مەسەلە ئەوەیە جۆرو چۆنیەتی ئەو شتەی گەدەی پێ تێر دەکەی چۆنە !

ئایا تەنیا دیمەنو ڕواڵەتێکی جوانی پێوەیەو وەک گوێزی کوێر قرپۆکو

بێ نێوەڕۆکە ، یان بە پێچەوانەوە •

دەمەسەلەی یادی خواو پەیوەندی هەبوونیش لەگەڵ خوا لە ژیانی مرۆڤدا بەهەمان شێوە ، یادی خواو پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا بۆ ژیانی مرۆڤ وەک ڤیتامین وایە •

هەر چەندە ژیانت پڕ پڕ بێ لە چالاکیو خەباتو تێکۆشان ، بەڵام مادام کردارو ئاکارو وتارو نیازو مەبەستەکانت ، بەس قاوغێکی بۆشی بەرواڵەت جوانو بەدەوی بێ نێوبنو ، ئیمانو بڕوایان تێدا نەبێو بەپێی ئیمان ڕێنموونی نەکرابنو ، هەڵقولاوی سەر چاوەی بڕواو پەیوەندی بوون لەگەڵ خوا نەبن ، مانای وایە وەک خۆراکە بێ ڤیتامینەکان شتێکی بۆشو بێ کاکڵنو ، مردووی بەدیمەن زیندوون •

بەڵێ بە نەبوونی ئیمانو پچڕانی پەیوەندی نێوان خواو بەندە شیرازەی ژیانی تاکو کۆمەڵ دەپچڕێو وەک جەستەیەکی بێ ڤیتامین دووچاری دەیانو سەدان دەردو نەخۆشی بێزەزاو کوشندە دەبن •

**وێنەی دووەم :**

ئەنجامی بێ بەش بوونی منداڵ(٣) لە سۆزی دایک وباب :

زانایانی دەروونناس دەڵێن : ئاتێک منداڵ بە گچکەیی لە سۆزو لوتفو خۆشەویستی دایکو باب بێ بەش دەبێ ، چەند دەردو نەخۆشیو گرفتو گرێ کوێرەی دەروونی تێدا پەیدا دەبنو زۆر نزیکە دووچاری چەندان خووی بەدو لادان ( انحراف ) بێ کە دواتر هیچ

---

(٣) النفس : انفعالاتها امراضها علاجها ، ص٦١٩ • د• علي كمال •

شتێك ناتوانێ ئەو کەمو کوڕی یەی بۆ پڕ بکاتەوەو بۆی تێ هەڵبێنێتەوە ، ئەمانــەت ـانای بــەناو بانک(٤) بیرت Burt [illegible] بــەرفراوانی لــەسەر تاوانو ڕووداوەکانی تاوانباران کــردوە ، دەڵێت : ئەورەترینو سەرەکی ترین هۆی مەترسی لێکراو بۆ پەیدا بوونی ئەو تاوانبارانە ئەو هۆیانەن کەپەیوەندی یان بە ژیانی خێزانەوە هەیە .

دەجا هەروەک چۆن بێ بەش بوونی منداڵ لە سۆزو خۆشەویستی دایکو باب ، دەبێتە هۆی پەیدا بوونی کەمو کوڕیو نەخشیو گرفتو گــرێی دەروونی ، بێ بەش بوونی مرۆڤیش لــە سۆزو خۆشەویستی بەرانبەر بەخوا ، لە ئیمان ، لە پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا ، دیسان دەبێتە هۆی پــەیدا بوونی ســەدان گرفتو دەردو نەخۆشی ، چونکــە هەروەک چۆن منداڵ وێڕای خواردنی خۆشو بەتامو نەرم ، حەوجێی پۆشو کۆشی پڕ سۆزو گەرمیش هەیە ، بۆیە بەبێ وی تووشی دەردو نــەخۆشــیو دەبێت ، مرۆڤیش بــە هــەمان پێودان وێڕای خــواردنو خواردنەوەو پۆشاکو جیسو .. هتد حەوجێی ئیمانو یادی خــواو پەیوەندی هەبوونیشە لەگەڵ خوادا و بەبێوی دووچاری سەدان جۆرە نەخۆشیو دەردو گرفتی دەروونیو کۆمەڵایەتی دەبێت(٥) .

**وێنەی سێیەم :**

ڕووەکی بێ بەش بوو لە تیشکی ڕۆژ چی لێ‌دێ ؟

---

(٤) اصول علم النفس . ص٥١٩ ، ٥٢٠ احمد عزت راجح .

(٥) نەک وەک مارکس دەڵێ ، کە گوایە پێویستی یە سەرەکی یەکانی مرۆڤ بریتین لــە : خــواردنو پۆشاکو جینس ! ، واتــە وەک ئاژەڵێك بێ کەمو زیاد ! وەنەک وەك مارکسو ئالقە لە گرێ یانی دەڵێن ، کە گوایە ئایین تریاکی گەلە . (اصول الفلسفة الماركسية ج١ ص٢٤٣ .

پێم وایە ئەسمان نیە ڕۆژێك لە ڕۆژان چاوی بە چڵە گیایەك یان بڕ کە ڕووەکێك نەکەوتبێ ، کە لە بەر ئەوەی تیشکی ڕۆژی تێ نەکەوتوە زەرد هەڵگەڕاوەو سیس‌و بێ‌دەو بووە ، هەڵبەتە ئەو چڵە گیایە یان ئەو بڕ کە ڕووەکە ئاوو خۆراك‌و هەوای بۆ دابین کراوە ، ئەمما چونکە لە تیشکی ڕۆژێ بێ‌بەش بوە حالی بەو حالە گەیوە ٠

جا بەهەمان شێوە ئەو مرۆڤەش کە هەموو پێداویستی‌یەکی ژیانی بۆ دابین دەکرێ ، بەڵام لە ئیمان‌و یادی خواو لەگەڵ خوا بوون بێ‌بەش‌و دەست بەتاڵە ، بەمەرەدی ئەو چڵە گیایە دەچێ‌و زەردو لاوازو بێ‌ڕەنگ دەبێ ، چ بەشێوەی تاك بێ چ بەشێوەی کۆمەڵ ٠

چاکترین‌و بەرچاوترین بەڵگـەو شایـەدی ڕاستی ئـەم قسەیەش واقیعی ئابەڕاوو بێ سەرەوبەرەی ئەو خەڵکەیە کە لە یەکێك لەو وڵاتانەدا دەژین کە بـە حیساب پێشکەوتوون لە هەردووك بەشی ڕۆژ هەڵات‌و ڕۆژ ئاوای جیهـاندا ، دەبینین دروچـاری سـەدان دەردو نـەخۆشی دەروونی‌و کۆمەڵایـەتی‌و سیاسی‌و ئابووری‌و ٠٠ هتـد بوون‌و ، وەك جەستەیەکی بێ ڤیتـامین ، یان وەك منداڵێکی لـە سۆزی دایك‌و باب بێ‌بەش ، یان وەك ڕووەکێکی تیشك نەدیتوو بێ حاڵ‌و زەردو لاوازو هەڵبزڕکاوو دەرددار کەوتوونە گۆڕێ ٠

بێگومان دەزانم کـە هەندێك کەسی ساویلکەو مێشك بـەنج کراو بەبیرو بیردۆزەکانی ئـەو وڵاتانە ، بڕوا بـەم قسانەم ناکەن‌و قەت بـە مێشکیاندا ناچێ کە شوێنێکی وەك ڕووسیاو ئەمریکاو چین‌و فەڕەنساو

ئەڵمانیاو سوید[٦] ، دانیشتوانیان تووشی دەردو نەخۆشیو گرفتو پەژارەو ناخۆشی بوون ، چونکە ئەوانە وا حاڵی کراون کە ئیسلام مایەی بەجیماوی ئیمەیەو ئایین تریاکی "[٧]لەو" پێشکەوتن‌و خێرو خۆشی‌و یەکسانی‌و داد ئەریش ئەگەر هەبێت هەر لەو ولاتانەیە کە بەپێی بیرو بیردۆزەکانی : مارکسایەتی‌و شیوعیایەتی‌و سەرمایەداری‌و نەتەوەپەرستی‌و ئەگزیستانسیالیزمایەتی‌و مارکیوزیزمایەتی‌و ، هتد ، بەڕێوە دەچن ، بەڵام بەدەردی کورد دەڵێن : دەنگی دەهۆڵی هەر لە دوورڕا خۆشە ، هەڵبەتە ئەوانەش وادیارە بەس لە وورەوە گوێ بیستی دەنگی دەهۆڵی پڕوپاگەندەی ئەو وڵاتانە بووون ، بۆیە سەروپێی خۆیان لێ بزر بووەو وەك دروێشی جەزبە گرتووی شێخێکی فێلزان گەرم بووون .

بەڵام کورد گوتەنی : خاوەن ماڵ دەزانێ ماڵ چی تێدایە !

بۆیە ئێمەش واز لە قسەی باکەیی‌و تووتی‌یانەی ئەو جۆرە کەسانە دێنین‌و دەچینە سەروکاری کۆمەڵێکی هەڵبژاردە لە زاناو چاوساغ‌و پسپۆڕو بلیمەتانی ئەو وڵاتانە ، تا بزانین لە ئەنجامی لە خوا دوورکەوتنەوەیانەوە حاڵیان بە چ کەیوەو دەنگ‌و باس چیە ! .

---

(٦) لە کتێبی [ پوختەیەك ... ]دا واقیعی دزێوو نا لەبارو بێ‌بەندو باری ئەو وڵاتە بە ناو پێشکەوتوانە پەردەی لە سەر لابراوە . بڕوانە لاپەڕە (٢٣٣) .

(٧) سوپاس بۆ خوا ئەڵقەی سێ‌یەمی زنجیرەی : ( دەبەرێك ڕاچوون .. )مان تەرخان کردوە بۆ پووچ کردنەوەی ئەو قسە بێ سەرو پێ‌یەی مارکس .

# ئەنجامی لە خوا بێ ئاگابوونی مرۆڤ

# لەم شارستانەتی یەدا

پەندێکی کۆن هەیە دەڵێت : [ لیس بالخبز وحده یحي الانسان ]
واتە : مرۆڤ بەس بە نان ناژی !

بـەڵێ بەڕاستی مرۆڤ مرۆڤەو بێجگە لە نان و ئاو حەوجێی شتی دیکەشە ، بەڵام بەبیرو بۆچوونی شارستانەتی سەدەی بیست ــ کە لـە ڕوانگـەی ئازەڵناسـی مارکس و داروین و فرۆیدەوە سـەیری مرۆڤ دەکات ــ مرۆڤ ئەگەر بێت و پێداویستی یە ماددی یەکانی بۆ دابین بکرێن پێویستی بە هیچ شتێکی دیکە نیە ، چونکە لە ڕوانگەی ئەو شارستانەتی یەوە ئایین چەکی دەستی بورژواو ستەمکارو سەرمایەدارەکانەو[1] کۆسپ و لەمپەری سەر ڕێی بەرەوپێش چوون و شارستانـەتی یەو هیچ دەورێکی

---

(١) [ چونکە ئایین بە هۆی ئەوەوە کە لە نەزانی پەیدە دەبێ ، هەوڵی کۆڕینی لێکدانەوە زانستی یەکان دەدات بەلێکدانەوە خەیاڵی یەکان بۆ ئەوەی واقیع لە خەڵکی بشارێتەوە ... وە چینە چەوسێنەرەکان ئەم خەسڵەتەی ئایین بەکار دێنن بۆ ئەوەی چەوساندنەوەکەیان لە چاوی چینە ڕەنج دەرو ماندووەکان پەنهان بکەن . ] اصول الفلسفة الماركسية ج١ ص٢٤٢

وەسەیری [ نصوص حول الموقف من الدين ]بکە ص٢٥ لینین / مختارات جديدة .

بە کەلکی نەئێراوەو ناشکێرێ لە ژیانی مرۆڤایەتیدا[٢] .

---

(٢) لەڕاستیدا ئەو جۆرە نێروانینە سەبارەت بە ئایین هەڵقوڵاوی جیهانی ئیسلامی نیەو ، وەک زۆر جۆرە بیروڕاو قسەی دیکەی پاکەتی نیمچە خوێندەوارە ناریک بیرە بەزیوەکان لەوڵاتە ڕۆژ هەڵاتیو ڕۆژ ئاواییەکانەوە بە دیاری بۆ گەلی مسوڵمانیان هێناوە ، چونکە ڕۆژێک لەڕۆژان دامو دەزگای زانایانی ئیسلام [ برۆنۆ ] ناوێکی لە سەر ئەوە نەسووتاندوە کە گوتوویەتی ، زانیاری دەڵێ زەوی خڕە ! وە ڕۆژێک لەڕۆژان زانایانی ئیسلام [ گالیلۆ ]یەکی بانگ نەکردوە بۆ دادگاو داوای تۆبەی لێبکات لە سەر ئەوەی گوتوویەتی زانیاری دەڵێ : زەوی بەدەوری ڕۆژدا دەسووڕێتەوە ! بەڵکو ئەم جۆرە ڕەفتارە ناقوڵایانە درووشمی داروو دەستەی بە ناو مەسیحی کڵێسا بوون ، کە لەسۆنگەی ئەوەوە بە هۆی بەرەو پێش چوونی زانیاری درۆو دەلەسەو فێڵو پیلانە گڵاوەکانیان بۆ خەڵکی ئاشکرا دەبوون ، بە خوێنی سەری ئەو جۆرە مرۆڤە ئازادبیرو زانست دۆستانە تینوو بوون ، کە بڕوایان بە ئەفسانەکانی کڵێسا نەبوو دەیانزانی کە بەرنامەی خوا بۆیە نەهاتوە دەستەیەک لە پەنایەوە بژیەنو بیکەنە تریاکو مێشک تەزێنی خەڵکی .

ئەمما ئیسلام ، سوپاس بۆ خوا هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنیەوە ، پیشەی خەڵك هاندانو تیژکردن بوە ، بۆ پەی بردن بە نهێنییەکانی بوونەوەرو دۆزینەوەی یاساو دەستوورەکانی ، وە ئیسلام هەمیشە شۆڕشێك بوە دژی ئەفسانە پەرستیو لەسەر حیسابی ئایین ژیانو بێدادیو ستەمو چەوساندنەوە .

کەواتە : هۆ برا ڕۆشنبیرە ژیرەکان ! ئەگەر دەتانەوێ ڕۆشنبیرو ژیر دابنرێن ، لە پشت چاویلکەی بیرو بۆچوونەکانی بێگانەوە تەماشای ئیسلام مەکەنو لاسا کەرەوە مەبنو خۆتان بیر وەکەن . تێبینی : لە ئەڵقەی دووەمو سێیەمو چوارەمو پێنجەمی زنجیرەی [ دەبەرێك ڕاچوونی ... ]دا چارەسەری زوور بەی ئەو مەسەلانە کراوە .

بەڵام باوار لە کۆمەڵە قسەیەکی هەڵقوڵاوی سـەر چاوەی سۆزو هەڵچوونی بێ سەروبێ بێنین‌و ، بچینە سۆراغی کۆمەڵە زانایەکی پایـە بەرز کەقسەکانیان لە سەر بنچینەی ژیری‌و جەرباندن دەکەن‌و بە چاوێکی واقیع بینانـەوە سەیری شتی دەکەن ، بزانین هەڵوێستیان سەبارەت بـە شارستانەتی ماددی‌و بێ بڕوای سـەدەی بیست چی‌یـەو چۆن دەڕوانە ئایین‌و یادی خواو پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا !

**یەکەم : ویل دیورانت :**

[ ویل دیوارانت ] فەیلەسووفی بە ناو بانگ سەبارەت بە شارستانەتی سەدەی بیست دەڵێت : [ ڕۆشنبیری ئەمڕۆمان سادەیەو زانیاریمان جێی مەترسی‌یە  چونکە لە تەکنۆلۆجیاو ئامێردا گەلێك دەوڵەمەندو بەهێزین ، بەڵام لە دیاری کردنی ئامانج‌و مەبەستدا هەژارین ، ئەو هاوسەنگی‌یە ژیری‌یەی کە جاران لە ئیمان‌و بڕوای گەرمی ئایینی‌یەوە پـەیدا دەبوو ئێستا نەماوە .

زانیاری ـ ئایین لەگەڵدا نەبوو ـ کۆشك‌و تەلاری ڕەوشت‌و ئاکارە میتافیزیکی‌یەکانی لێ ڕووخاندووین‌و هەموو جیهان لە تاك پەرستی‌یەکی بێ سەرو بەرەدا نقووم بوە ، کـەنیشانەی پارچە بوون‌و تاریك‌و پێکی سروشت‌و ئاکارەکانمانە ... ئێمە بـە خێرایی‌یەکی بێ وێنە بە دەوری زەوی‌دا دەسووڕێینەوە ، بـەڵام نەدەزانین‌و نەپرسیشمان لێ کـردۆتەوە داخوا بەرەو کوێ دەچین !

ئایا ئەو شوێنەی بۆی دەچین‌و ئەو بارو دۆخەی تێی دەچین ، دەتوانین ئارامی‌و ئۆخژنێك بۆ دڵە نەسرەوتووو نا ئارامەکانمان وەدەست

بینین ! ئێمە بە خۆ بەو زانیاریەی کە بەهێزو توانای خۆی مەستی کردووین ویکڕا لە نێو دەچین‌و بەبێ حیکمەت [ زانیاری‌و ڕێنموونی تەواو ] ڕزگار نابین • ](٣)

بەڵام دەبێ ئەو حیکمەتەی ( ویل دیورانت ) بە ڕزگار کەری دەزانێ‌و بێجگە لەوی لەهەموو شتێکی دیکە بێ هیوا بووە چ بێ ؟!

هەڵبەتە زانیاری دوور لە بڕوای سەدەی بیست نیە ، چونکە ئەو هەموو گلەیی‌و ڕەخنەکەی لەویە ؛ ئنجا نابێ ئایینی شێوێنراوی مەسیحی بیت ، چونکە لە مێژە وازیان لێ هێناوەو لێی نائومێد بووون •

کەواتە : دەبێ ئەو حیکمەتە چ بێ ! ئەمن یەکەباری خۆم دەڵێم ئیسلامەو ئەگەر ( ویل دیورانت )یش وەک ئێمە ئیسلامی ناسیباو کەوتبایە بەرچاوی هەر وای دەگوت •

## دووەم : ئەریك فرۆم :

دەروونناس‌و کۆمەڵناسی بە ناو بانگی ئەڵمانی لە ژێر سەر باسی : ئایا ئێمە ئاسوودەیی‌و ئارامی گیانیمان هەیە ؟ دا دەڵێت :

[ وەرە با بە چاوێکی دەروونناسانە سەیری ڕاستی‌یەکان بکەین ، لەم سەد ساڵەی دواییدا ئێمە دانیشتوانی جیهانی ڕۆژ ئاوا ، لە هەموو کۆمەڵگایەکی مرۆڤایەتی زیاتر ــ لە سەرانسەری مێژوودا ــ لە کاروباری ماددیدا پێش کەوتووین ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە هۆی دیاردەیەکەوە

---

(٣) [ لذات فلسفه ] ویل دیورانت ترجمه عباس زریاب مقدمة • هەروەها کتێبۆلکەی ( بحث حول السعادة ) سعدي عبدالعزيز ص١٩ •

کەپێی دەڵێن ( جەنگ ) ملیۆنەها مرۆڤمان کوشتوە ، بێجگە لە چەنگە کچکەکان جەنگە گەورەکانی ساڵی ١٨٧٠ ، ١٩١٤ ، ١٩٣٩ مانهەبووە •

••• بە نێو گێژاوی ئەم سەرکێشی‌یەی وێرانکاری‌و بەدگومانی‌و مالیخولیایی‌یەدا ، ڕەفتاری مە لەگەڵ ڕەفتاری مرۆڤی سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا ، هیچ جیاوازی‌یەکی بە •

••• ئایا سنووری نەخۆشی دەروونی لەوڵاتە جۆراو جۆرەکانی ڕۆژ ئاوادا لە کوێ‌یە ؟ بەوبەڕێی سەر سوڕمانەوە پێویستە بڵێین زانیاری‌یەك کە وەڵامگۆی ئەم پرسیارە بێ ، نیە • هەر چەندە شارەزایی‌و سەر ژمێری وردو تەواو دەربارەی سەر چاوە سروشتی‌یەکان‌و تەرازووی ئەدایك بوون‌و مردن هەیە ، بەڵام ئاگاداری تەواو سەبارەت بە نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکان لە بەر دەستدا نیە •

••• تاقە شارەزایی‌یەك كە بتوانێ تا ئەندازەیەك جێی پشت پێ بەستن بێت لە مەسەلەی نەخۆشی دەروونی‌دا ، ئەو سەر ژمێری‌یەیە کە پەیوەندی بە خۆکوژی‌و خەڵك کوژی‌و مەیخۆری‌یەوەیە •

بێگومان خۆکوژی ( انتحار ) مەسەلەیەکی هاڵۆزەو ناگونجێ تەنیا هۆیەك بە پەیداکەری وی دابنرێ •• بەڵام بە ئیحتیمالی نیزیك لە ڕاستی‌یەوە ، زیاد بوون‌و پەرەستاندنی لە نێو هەر گەلێکدا بەڵگەی بێ سەرەو بەرەیی‌و نەخۆشی گیانی‌یە ، چونکە وەك لە سەر ژمێرەکان‌دا دەردەکەوێ خۆکوژی بە هۆی نەداری‌یەوە پەیدا نابێ ، ژمارەی خۆ کوژەران لەوڵاتە هەژارەکان‌دا کەمترەو زۆر بوونی خۆ کوژی لە ئەوروپا پەیوەندی‌یەکی ڕاستەوانەی هەیە لەگەڵ بەرەو پێش چوونی

ماددی‌دا •• بێگومان مەیخۆریش دیسان نیشانەی ناڕێك و پێكی‌و شێواوی گیانی‌و عاتیفی‌یە •

•• ئەوەش سەر ژمێریکی خۆ کوژی‌و مرۆڤ کوژی مەیخۆری لە چەند ولاتێکی بەرچاوی ئەورووپی‌و ئەمریکایی سەرەوودا :

| ناوی وڵات | لە هەر (١٠٠٠٠٠) کەسی بالغ | | | |
|---|---|---|---|---|
| | خۆکوژی (١) | خەڵك‌کوژی (٢) | مەیخۆری (٣) | ساڵی |
| وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | ١٥٥٢ | ٨٥ | ٣٥٩٢ | ١٩٤٨ |
| فەرەنسا | ١٤٨٣ | ١٥٣ | ٢٨٥٠ | ١٩٥٤ |
| ئینگلیز | ١٣٤٣ | ٨٦٣ | ١١٠٠ | ١٩٤٨ |
| سوێد | ١٩٧٤ | ١٠١ | ٢٥٨٠ | ١٩٤٦ |
| نەرویج | ٧٨٤ | ٣٨ | ١٥٦٠ | ١٩٤٧ |
| ئیسپانیا | ٧٧١ | ٢٨٨ | | |
| ئوستراليا | ١٣٠٣ | ١٥٧ | ١٣٤٠ | ١٩٤٧ |
| ئیتاليا | ٧٦٧ | ٧٤٨ | ٥٥٠ | ١٩٤٢ |
| دانیمارك | ٣٥٠٩ | ٦٧ | ١٩٥٠ | ١٩٤٨ |
| فلاند | ٢٣٣٥ | ٦٤٥ | ١٤٣٠ | ١٩٤٧ |
| پرتغال | ١٣٢٤ | ٢٧٩ | | |
| کەنەدا | ١١٤٠ | ١٦٧ (٤) | | |

(٤) سەر ژمێری‌یەکانی خانەی یەکەم‌و دووەم لی ساڵی ١٩٥١ز ، باشە دەبێ لە ساڵی (١٩٨٥)دا ئەو ڕێژەیە چەند هەڵکشیبێ !!

ئـەم ژمارانە سەرسام کـەرو ڕاچڵەکێنەرن ، هـەر چەندە ئـەو بیردۆزەیەش کە دەڵێ : زۆر بوونی ژمارەی خـۆ کوژەران لـە نێـو هەر کەڵێکدا نیشانـەی نەبوونی ئارامیو سـەلامەتی دەروونـە ، جێی (ومان بێ •

بەڵام ڕێژەی هاوسەنگی ژمارەو سەر ژمێری مەیخۆریو خۆ کوژی دەلوێ بـە دیاردەیـەکی بەرچاوی نەبوونی ئارامیو ئۆخژنی کۆمەڵـ(ا حسێب بکرێ •

جا لـە سەر بنچینەی دیاردەی ناوبراو ، دەبینین کـە دیموکراتی ترینو پێشکەوتوو ترین وڵاتانی ئەورووپاو دیسان وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کـە بـە پێشکەوتوو ترین وڵاتی جیهان دادەنرێ ، لـە هەموو گۆشەیەکی دیکەی دنیا دەروون ئەپرێویو گیان نەخۆشی زیاترە •

... ئایا ئەم ژمارانە بەڵگەو شایەدی ڕاستی ئەو قسەیە نین کـە دەڵێت : « چەمکی ژیان بەس دابین کردنی پاروە نانێك نیە » ؟

وە بـەڵگەو شایەدی ئەوە نین : کـە شارستانەتی نوێ نەیتوانیوە بازو مەبەستو ئامانجە قووڵەکانی مرۆڤایەتی بهێنێتەدی !؟ ](٥) •

دیسان ئەریك فرۆم هەر لەو بارەوە دەڵێت :

[ لە حاڵێکدا ئێمە توانیومانە چەندەها شتی سەر سوڕهێنەر دروست بکەین ، ئەمما نەمان توانیوە خۆمان وا لێ بکەین کە نرخی ئەو هەموو هەوڵو کۆششە بزانین ، ژیانی ئێمە برایەتیو بـەختیاریو ڕەزامەندی

---

(٥) [ جامعه سالم ] اریك فروم ، ترجمـه اکبر تبریزی ، ص١٧ تا ص٢٥ ، چاپ دوم •

تیدا نیه ، بەڵکو بڕە لە پەشێوی و سەر گەردانی و بێ ئارامی گیان ، کە بەشێوەیەکی مەترسی دار لە حاڵەتی شێتی وەنیزیک کەوتووین • ][6]

**سێیەم : الکسیس کاریل :**

( ئەلکسیس کاریل ) سەبارەت بە هەمان مەسەلە دەڵێ :

[ پشکیری کردن لە گەشەکردنی لایەنەکانی عاتیفەو سۆز ، یان جوانی ، یان ئاینی ، چەند مرۆڤێکی نزمی خاوەن بیرو هۆشی تەسك و ناتەواو دروست دەکات ، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێستا فێر کردنی ژیرانە بۆ هەموو کەسێك داین کراوە ، بەڵام ئێستاش ئەو جۆرە کەسانە لە هەموو جێیەك و لە هەموو کاتێکدا دەبینین ][7] •

لە جێیەکی دیکەدا دەڵێت :

[ جێی سەر سوڕمانە کە نەخۆشییە ژیرییەکان ، لە تێکڕای هەموو نەخۆشییەکان پترن ••• لە هەر (٢٢) کەسی نیۆیۆرکی پێویستە یەکێکیان ناو ناوە بخرێتە یەکێك لە خەستەخانە ژیرییەکان •

وە لە وڵاتە یەکگرتووەکان خەستەخانەکان سەر گەرمی خزمەتی ژمارەیەك لە بیرو هۆش لاوازانە کە هەشت ئەوەندەی ژمارەی سیل دارانن • چونکە هەموو ساڵێك دەورو بەری (٨٦٠٠٠) کەسی نوێ دەچنە خەستەخانە ژیرییەکان •••

لە ڕاستیدا نەخۆشییە ژیرییەکان زۆر سامناك ترن لە سیل و

---

(٦) [ روانکاوی و دین ] اریك دروم ، ترجمة آرسن نظریان ص٨ •
(٧) الانسان ذلك المجهول ترجمة عادل شفیق ص١١٧ •

سێرپەنجەو نەخۆشی یەکانی دڵو گورچیلە ، بەڵکو لە تیفۆس و طاعون و کۆلێراش ...

وە هیچ گومانی تێدایە کە زۆری ژمارەی مێشك نەخۆشان و دەروون نەخۆشان بەڵگەیەکی دڵنیاکەرە لە سەر ئەو کەم و کورییە سامناکەی کە شارستانەتی نوێ پێیەوە دەناڵێ . ](٨)

ئەلکسیس کاریل لە کتێبێکی دیکەی دا دەڵێت :

[ نەبوونی دوعاو پاڕانەوە لە نێو هەر گەلێکدا دەبێتە هۆی ڕووخان و نەمانی حەتمی ئەو گەلە ...

ئەو کۆمەڵ و گەلانەی کە هەستی حەوجێ بوون بە دوعایان لە نێو خۆیاندا کوشتوە ، بێگومان لە خرابەکاری و نەمان پارێزراو نابن ... ](٩)

لەجێ یەکی تردا دەڵێت :

[ مرۆڤ هەروەك چۆن حەوجێی ئاوو ئۆکسجینە حەوجێی خواشە ، هەستی خواناسی وەك هەر کام لە هەستی شت زانین و هەستی ڕەوشتی و هەستی جوانی و تیشکی ژیری ، کەسایەتی مرۆڤ دەپشکوێنێ و بەرەو تەواوی دەبات .

گومانی تێدایە کە سەرکەوتوویی لە ژیاندا پەیوەندی بە گەشە کردنی تەواوی هەر کام لە چالاکی یەکانی فیسیۆلۆجی ( جەستەیی ) ، ژیری ، گیانی و دەروونی ئێمەوە هەیە . ](١٠)

---

(٨) هەمان سەر چاوە ص١٢٣ ، ١٢٤ .
(٩) [ نیایش ] ( الدعاء ) دکتر الکسیس کارل ترجمە دکتر علی شریعتی . ص١٥ ، ١٧ .
(١٠) سەر چاوەی پێشوو ص٢٤ .

**چوارەم : پرۆفیسۆر کارل یۆنگ :**

کارل یۆنگ دەروونناسی بە ناو بانگ دەڵێت :

[ لە ماوەی سی ساڵی دواییدا کۆمەڵە خەڵکێك لە هەموو وڵاتانی جیهان هاتوونە لای من ، من سەدان نەخۆشم چارە سەر کردوە ، لە نێو هەموو نەخۆشەکانمدا کە نیوەی دووەمی تەمەنیان ـ واتە لە (٣٥) ساڵی بەولاوە ـ دەگوزەراند یەکێکم دەست نەکەوت کـە گیرو گرفتەکەی بەیوەندی بە پەیدا کردنی بیرو باوەڕێکی ئاینییەوە نەبووبێت سەبارەت بە ژیان •

بەو پەڕی دڵنیایییەوە دەتوانین بڵێین کـە هـەر کام لەوانە لەو لایەنەوە نەخۆش بوو بوون کە ئەو شتەی ئاین بە شوێنکەوتوانی خۆی دەبەخشێ لە دەستیان چوو بوو ، وە ئەوانەی کە باوەڕی ئاینی خۆیان وەدەست نەهێنا لە ڕاستیدا هیچیان دەرمان نەکران • ][1]

کـەوانە :

ڕای زانایان سەبارەت بەم شارستانەتیە ماددییەی سەدەی بیست ئەوەیە ، کە لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی لە خوا دووچاری لاتەڵیو لاسەنگی بوەو بە سەدان دەردو نەخۆشی کوشندەی دەروونیو ژیریو کۆمەڵایەتییەوە دەتلێتەوە ، وە هەتا دەست بە ئاینێکی تەواوەوە نەگرێ ڕزگاری نابێو هەر لـە گێژاوی گرفتو گرێ کوێرەو دەردەداریدا دەمێنێتەوە ، چونکە تەنیا لە بن سێبەری ئاینو خواناسیدا ژیان ئامانجی پەیدا دەبێو لە ئەنجامی بێ دینیو خوانەناسیدا ، ژیان بێ تام دەبێو

---

(١) [ روانكاوى انسان ] سيد كاظم مدرسي ، ص٣٩ •

ووچو بێ ئامانج دێتە بەر چاوان •

خوێنەری سەنگینم !

ئێستاش دوای ئەوەی پێناسەی یادی خودا مان زانیو زانیمان یادی خواو پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا چ پلەو پایەیەکی بەرزی هەیە لە تەرازووی خواداو ، ڕوونمان کردەوە کە دەوری یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا چۆنەو ، خستمانە ڕوو کە شارستانەتی[(١٢)] سەدەی بیست بە هۆی بێ ئاگا بوونی لە خوا ، تووشی چ بارو دۆخێکی ناهەموارو بێ سەرە وبەرە بووە ، ئێستا دوای ئەم باسانەی کەوەك ڕێ خۆشکردنێك وابوون بۆ چونە نێو مەبەستی بنچینەیی‌یەوە ، بە پشتیوانی خوای بەخشندەو کار بەجێ دەتوانین بچینە نێو کاکڵی مەبەستەوەو لە چەند بەشێك‌دا گرنگی‌و کاریگەری یادی خودا لە ژیانی مرۆڤدا بخەینە ڕوو •



---

(١٢) لە ڕاستی‌دا ئێمە چاو پۆشی‌یەکی زۆرمان بە کار هێناوە کە وشەی شارستانەتی ( الحضارة )مان بۆ بارو دۆخی ئێستای وڵاتە ڕۆژ هەڵاتی‌و ڕۆژ ئاوایی‌یەکان بەکار هێناوە ، چونکە سەرەکی ترین مەرجی شارستانەتی ئەوەیە کە لە پێناوی بەرز کردنەوەی مرۆڤو ڕێز لێ گرتنی‌دا بێ ، بەلام ..!؟

# بەشی یەکەم

## پەیوەندی نێوان یادی خوداو بڕوا

یادی خوا دەبێتە هۆی قرارو بوونو بەشە کردنی بڕوا ، خوای رانا فەرموویەتی : [ ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لآيات لاولي الالباب الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والارض ربنا ما خلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار • ] آل عمران – ١٩٠ ، ١٩١ •

واتە :

[ بەڕاستی لە دروست کردنی ئاسمانەکانو زەوی‌و جێ گۆڕکەی ... جا خوایە گیان لە سزای ئاگری دۆزەخ چەپاڵەمان بدە ] •

... لێرەدا دەبینین : خوای بەخشندە ، پەی بردن بە وردەکاری‌و ڕێك‌و پێکی بوونەوەرو تێگەیشتنی ڕازو نهێنی‌یەکانی ، تایبەت کردوە بەو کەسانەوە کە خاوەنی زیری‌و لێکدانەوەن ، ئنجا دوایش لە باسی ئەو کەسانەدا دەڵێت : ئەوانە کەسانێکن کە هەمیشە خوایان لە یادە ، بە پیوەبن ، بەدانیشتنەوە ، یان بە ڕاکشاوی بوونەوە •

بەڵێ بەڕاستی مرۆڤێك خاوەنی دڵو دەروونێکی پڕ لە بڕوا نەبێت ، سوودێکی ئەوتۆ لەو زانیاری‌و شارەزایی‌یە وەرناگرێ کە زیری بەتۆڕو شەداوی هەستەکان دەستگیریان دەکات ، وەك پەروەردگار دەفەرموێ : [ وكأين من آية في السموات والارض يمرون عليها وهم عنها معرضون • ] يوسف – ١٠٥ •

واتـه :

زۆر نیشانەو بەڵگە هەن لە ئاسمانو زەوی‌دا کە ـ بێ بڕوایان ـ بەسەریان‌دا تێپەڕ دەبن‌و بەلایان‌دا ڕەت دەبن ، بەڵام لە حاڵێك‌دا کە پشتیان تێ کردوون • [ واتە : نیان ورد نابنەوەو تێیانەوە ڕانامێنن ] •

بەڵێ هەروەک چۆن بابایەک کە پشت لە شتێك دەکات مەودای سەرنج دان‌و تێوەڕامانی نابێ ، مرۆڤی بێ‌بڕواش کە خاوەنی دڵێکی مردووو بێ هەست‌و نەستە ، ئەگەر هەزار دیمەن‌و نیشانەی دڵبزوێن‌و سەرنج ڕاکێش بەدی بکات ، بێ‌سوودەو هیچی تێدا بەدی ناکات شایانی باس بێت ! هەڵبەتە ئەوەش شتێکی ئاسایی‌و سروشتی‌یە ، چونکە ئاو هەر چەندە سازگارو شیرین بێ ، مادام بچێتە زاری بابایەکی نەساغەوە حەتمەن تاڵ دەنوێنێ ، تاڵی‌یەکەشی خەسڵەتێکی زاتی خۆی نیەو ، لە سروشتی بابای نەخۆشەوە پێیەوە نووساوە •

جا هەروەک چۆن ئەگەر بابای نەساغ بیەوێ چاك بێتەوەو سروشتی ساف بێت‌و ، ئاوی سازگاری بەزاری شیرین بێ ، پێویستە هەوڵی پەیداکردنی چارەسەرو دەرمانێک بدات ، کە نەساغی‌یەکەی تێدا لابەرێ ، بە هەمان دەستوور کەسێکیش بیەوێ سوود لە زانیاری وەرگرێ‌و بە چاوی دڵ سەیری دیاردە ڕێک‌و پێکەکانی بوونەوەر بکاو تێیان تێ بگات ، پێویستە هەوڵی سپی کردنەوەو ساف بوونەوەی دڵ‌و دەروونی بداو لە چڵك‌و چەپەرو ژەنگ ژاو پاکی وەکات ، ئنجا چاکترین‌و کاریگەر ترین هۆش بۆ مشت‌و ماڵ‌و تیف تیفەدانی دڵ بریتیە لە ڕوو پێ وەرسووڕاندن ( وەرچەر خاندن )ی دڵ‌و دەروون ، بەرەو ئەو سەرچاوەیەی لێیەوە هاتوە ، ئایا گۆربە چ کاتێك لەو دەمە بە کەیف

ترو بەدەوترە ، کە لە نێو باوەشی گەرمو کوڕی دایکی‌دا خۆی دەبینێ ؟!!

بەڵێ خوێنەری ئازیز ، یادی خودا دەبێتە هۆی شاد بوونی گیانو گەشە کردنی‌و نوێ بوونەوەی‌و گەشانەوەی •

وەیادی خوا خەسڵەتی بێداری‌و هەستیاری‌و زەین ڕوونی‌و بیر تیژی لە مرۆڤ‌دا پەیدا دەکاو ، وای لێ دەکات بە سەرپێیی‌و لام سەللایی تەماشای شتی نەکاو ، سەبارەت بە هەموو شتێک قووڵ بێتەوەو بە دەریای بیرکردنەوەدا بچێتە خوار ، بێگومان ئەو کەسەی کە کوتوویەتی :

وفي كل شيء له آية تدل على انه واحد

واتە : لە هەموو شتێک‌دا نیشانەو بەڵگەی یەکتایی‌و بێ هاوەڵی خوا هەیە • هەر یەکێك بووە لەو جۆرە کەسانەی کەدڵو دەروونیان هێندە بەتیشکی ڕۆژی یادی خواو لە ئەهلی خوا بوون درەوشاوەتەوەو سافو بێ خەوش بووە ، هەرچی چاویان تێی هەڵەنگوتوەو لێی ورد بوونەوە گەورەیی‌و دەسەڵاتو زانیاری‌ی خوایان تێدا بەدی کردوەو ، بوونەوەرو دیمەنە دڵفڕێنەکانی‌یان لێ بۆتە میحرابێکی هەرە بەرزی کڕنووش بردنو خوا پەرستی •

ئەوە لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە شتێکی ڕوونو بەرچاوەو

---

(١) بۆ وێنە سەیری ( المدخل الى علم النفس الحديث ) نووسینی : رکس نایتو مرجریت نایت وەرگێڕانی دکتۆر : عبد علي الجسماني / ١٩٨٤ر ص (٢٥٤)بکە •

رانیاری دەروونزانییش دانی پێدا هێناوە کە دووبارە کردنەوە ز التكرار ی هەر شتێك دەبێتە هۆی چەسپانو جێ گیر بوونی لەزەینو بیرو هۆشو دڵو دەروونی مرۆڤدا[1] ، بۆ وێنە : پارچە پەخشانێك یان هۆنراوەیەك مەگەر بەدەگمەن دەنا هیچ کەس نیە بە یەك جار خوێندنەوە بتوانێ لە مێشکیدا تۆماری بکات ، بەڵام ئەگەر بێتو چەند جارێك دووبارەی بکاتەوە ، دێتە زەینییەوە ، خۆ ئەگەر بێت زیاترو زیاتر دوو بارەی بکاتەوە ، ئەوە دەبێتە پارچەیەك وبەشێك لە بیرو هۆشو دەروونی ، بۆ نموونە : سوورەتی فاتیحە بۆتە بەشێك لە بیرو هۆشو دەروونی هەر نوێژکەرێك •

کەواتە : هەر شتێك مرۆڤ زۆر بیری لێ بکاتەوەو لەگەڵی خەریك بێتو باسی بکاتو یادی بکات لەگەڵ بیرو زەینیدا تێکەڵ دەبێ ، هەتا لە ئەنجامدا لەگەڵی ئاوێتە دەبێو بە هیچ شتێك لێی جودا نابێتەوە •

کەواتە : زۆر یاد کردنی خواو بەردەوام بوون لە سەری لەلایەن مرۆڤەوە ، دەبێتە هۆی چەسپاندنی گەورەییو دەسەڵاتو ڕێزو سامو خۆشەویستی خودا لە دڵو دەروونیدا ، بۆیەش پەروەردگار فەرموویەتی : [ یا ایها الذین آمنوا اذکروا الله ذکرا کثیرا ••• ] الاحزاب ـ ٤١ •

واتە : ئەی بڕوا دارینە بە یاد کردنێکی زۆر یادی خوا بکەن •

جا مادام وابێ ، خوێنەری سەنگینو خۆشەویستی بڕوادار ! ئەگەر دەتەوێ دڵو دەروونت ساف بێتەوەو ئیمانو بڕوایەکەت زیاتر بێو چەسپاو ترو درەوشاوە تر بێت ، هەتا دەتوانی یادی خوا بکە ، بە تەنێو بەکۆمەڵ ، بە پەنهانیو بە ئاشکرا •

بەڵام بەیاد کردنێکی قورئانی ، واتە یاد کردنێک کە بیر کردنەوەو بیفکرینو ورد بوونەوەی لەگەڵ دا بێت ، نەک جۆرە یادکردن [ ذکر ]ێکی گێلانەی‌وا : کە بریتی بێ لە ترکە ترکو شیرە شیرو هاتو هووێکی بێ سەروبێو بێ گیان •

هەڵبەتە بابایەکیش بەپێی فەرمانی قورئانو ئەو ڕێبازەی ئەو بۆ یادی خوا دیاری کردوە ، یادی خوا نەکاتو ، سوننەتو ڕێو شوێنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ڕەچاو نەکات ، دوایی کە بە هۆی یادکردنی خواوە هیچی دەستگیر نەبووو سینەو دڵی شوعلەوەر نەبوو ، بێجگە لە خۆی بۆی نیە ڕووی ڕەخنەو گلەیی لە کەس بکات ، چونکە خوای میهرەبانو کاربەجێ هەر ئامانجو مەبەستێکی خستبێتە بەر چاوی ئینسان ڕێگەو چۆنیەتی وەدەست هێنانیشی بۆ دیاری کردوەو ، لەو ڕێگەیە ئەوە نەبێ کە خودا دیاری کردوەو بەو چۆنیەتی‌یە نەبێ کە فەرمانی پێکردوە دەستگیر کردنی ئەو ئامانجو مەبەستە مەحاڵە •

## بەشی دووەم

# پەیوەندی نێوان یادی خواو خۆشەویستی

## پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم

یادی خوا دەبێتە هۆی زیاتر خۆ شویستنی پێغەمبەرو پتر پابەندی بەرەوشتو ئاکاری بەرزی یەوە ، خوای بێ هاوتا لەو بارەوە فەرموویەتی :
[ لقد كان لكم في رسول الله اسوة حسنة لمن كان يرجو الله واليوم الآخر وذكر الله كثيرا • ] الاحزاب ـ ۲۱ •

واتـه :

بـە ڕاستی لە پێغەمبەری خوادا صلى الله عليه وسلم ڕابەرایەتیو پێشڕەوایەتی یەکی باش هەیە بۆ ئێوە[۱] ، بۆ کەسێك کە بە تەمای[۲]

---

(۱) لێرەدا وشەی أسوة بە واتای قدوة واتە : ڕابەرو پێشەواو ڕدێن سپی لێکدراوەتـەوە ، ئـەم مانایەش پـەسندکـراوی زووربـەی توێژەرەوانە بۆوێنـە : ( ابن كثير ) ج۳ ص٤٧٤ • ( بيضـاوي ) ج۲ ص۲٤۲ • ( مختصر تفسير الطبري ) ص٤٧٤ • ( في ظـلال القرآن ) ج٦ ص (٥٥٨) ط٧ • واتایەکی دیکە شی ئەوەیە کە لە پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم خەسڵەتێك هەیە ، ئێوە شیاوی ڕەچاو کردنی ، کە بریتیە لە خۆڕاگریو ئازایەتی •

(۲) ئەوە واتایەکی وشەی ( يرجو )یە ، مانای دیکەی ئەوەیە ، کە بۆ هەر کەسێک خـوای گـەورەو ڕۆژیدوایی خۆش دەوێو لێیـان دەترسێ ، ( بيضاوي ) ج۲ ص۲٤۲ •

- بەزەیی‌و بەخشندەیی - خواو - نازو نیعمەتی ژیانی - ڕۆژی دوایی‌یە ، ە زۆریش یادی خودا دەکات •

وەک دەبینین لەم ئایەتەدا سوود وەرگرتن‌و بەهرەمەند بوون لە ڕابەرایەتی‌و پێشڕەوایەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم تایبەت کراوە بە کەسانێکەوە کە دوو مەرجیان تێدا هاتبەدی :

یەکەم : بڕوا بە خوا بوون‌و خۆشویستنی‌و لێ ترسانی ، یان چاوەڕوان کردنی پاداشت‌و بەخشینی‌و تووڕەیی‌و سزای ، کوردانەتر بڵێین ، دان سوین‌و خۆ هەڵبڕینەوە بە تەما بەهەشتێوە ، لەرزین‌و ڕاچڵەکین لە ترسی دۆزەخێ •

دووەم : زۆر یاد کردنی خوا ، واتە : زۆر لەگەڵ خوا بوون بەدڵ‌و مێشک‌و ڕەفتارو ئاکار •

کەواتە : یادی خوا مەرجێکی سەرەکی‌و بنەڕەتی‌یەو هەبوونی شتێکی حەتمی‌و پێویستە لە هەر کەسێکدا کەدەیەوێ شوێن پێی پێغەمبەر هەڵگرێ‌و ڕەوشت‌و خووو ئاکاری وی وەرگرێ •

ئێستا بانۆزێک وردتر سەرنج بدەین‌و زیاتر ڕۆچین :

بێگومان پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نوێنەرو ڕەوانە کراوی خوایەو مەبەست لە نێررانی ئەوەیە ، کەخوای بەرزو بێوێنە بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست بە مرۆڤایەتی بناسێنێ ، کەواتە : خوا ئامانج‌و مەبەستەو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هۆو ئامرازی گەیشتن بەو ئامانجەیە ، بۆیە خوای زاناە قسە لە جێ لەم ئایەتەدا فەرموویەتی کەسێک لە پێغەمبەرایەتی‌و پێشەوایەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

بەهرەمەند دەبێ ، کە بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێو زۆر یادی خوا بکات •

بەڵێ بێگومان کەسێك خودا نەناسێو بڕوای پێ نەبێ ، حەوجار حەوجار نوێنەرەکەی ناناسێو شوێنی ناکەوێ • جا ڕەنگە لێرەدا یەکێك بڵێ : جا مادام خوا ناسین ئامانجو مەبەست بێتو پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم بەس هۆو ئامراز بێ ، من دوای ئەوەی خوام ناسی چ حەوجێم بە ناسینو شوێن کەوتنی پێغەمبەر دەکات !!

لە وەڵامدا دەڵێین :

نەخێر زۆرت پێویستی پێیەتی ، چونکە :

یەکەم : خوا ناسی پلە پلەیەو لە ڕێی زیری ڕووتەوە قەت مرۆڤ ناتوانێ بە هەموو پلەکانی خواناسیدا سەرکەوێو بیانبڕێ •

دووەم : گرێ کوێرەو گیرو گرفتی مرۆڤ لە سەرەتای مێژووەوە ، سەبارەت بە هەڵوێستی لە ئاقار خوادا • ئەوە نەبوە کە نەیتوانیوە پەی بە هەبوونی بەرێو بیناسێ ، بەلکو گیرو گرفتی سەردڵو مێشکی مرۆڤ سەبارەت بەناسینی خودا ئەوە بووە کەنەیتوانیوە هەڵوێستێکی ڕاستو دروست دەربارەی خوای بەرزو بێ هاوتا بنوێنێ ، بەو جۆرە کەڕەتێك لە سەرزمانی فەلسەفە بە زیری[٣] ڕووت ( العقل المطلق )و جارێك بە

---

(٣) [ افلوطین ] خاوەنی ئەو ڕایەبوو ، ( قصة الایمان ) الشیخ ندیم الجسر ص٥٢ ط٣ •

زماره[٤] ( العدد )و جارێك بە ئاگرو[٥] جارێك بە چوار توخمەكان ( گڵو ئاگرو ئاوو با )[٦] لە قەڵەم دراوە ، وە كەرەتێك لە سەر زمانی یۆنانی یە ئیغریقی یەكان بۆ هەركام لەئاوو باو هەورو ئاگرو جوانی و برووسكەو .. هتد خوایەكی تایبەتی دانراوە[٧] .

وەكەرەتێك لە سەر زمانی زەردەشتی یەكان خوای خێرو چاكە ( یزدان )و خوای شەڕو خراپە ( اهریمن ) لە باتی پەروەردگاری بوونەوەر ڕانوێنراون[٨] .

ئنجا بڕو باڵاتەو ئەفسانەی بت پەرستو شەیتان پەرستو ئەستێرەو مانگو ڕۆژ پەرستو مادده پەرستو ، خەیاڵ بڵاوی جوولەكەو خاچ پەرستەكانیش سەرباره !

بەڵێ :

مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژوو بە هۆی ڕێنموونی و ئامۆژگاری پێغەمبەرانەوە ( علیهم الصلاة والسلام ) نەبێ نەیتوانیوە هەڵوێستێكی ماقووڵو ڕاستو گونجاو لە ئاقار خوادا بنوێنێ .

---

(٤) [ فیثاغور ] خاوەنی ئەو بۆچوونە بوو ، سەر چاوەی پێشوو ص٣٠ .

(٥) [ هرقلیط ] ڕای وابوو ، هەمانە سەر چاوە ص٣٣ .

(٦) [ امبدوقلیس ] وای دەگوت ، وە ئەو ڕایەی وی هەتا سەدەی (١٨)ی زایینی لە ئەورووپادا هەر باو بوو . سەر چاوەی پێشوو ص٣٣ .

(٧) [ جاهلیة القرن العشرین ] محمد قطب ط ١٩٧٥ ص٢٥ تاكو ص٣٢ .

(٨) ( خاتم النبیین ) ج١ ص١١ ، محمد ابو زهرة .

کەواتە : ڕاستە خوا ناسین‌و خوا پەرستی ئامانجە ، بەڵام ئـەو ئامانجە بەبێ شوێن کەوتنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شتێکی چاوەڕوان نەکراوو مەحاڵە •

وەلە واقیعیش‌دا لە نێوان خواناسی‌و پێغەمبەر ناسی‌دا پەیوەندی ، کار لێک کردنێکی دوو سەرە هەیە ، چونکە ئینسان بـە هـۆی ناسینی خوداوە دەکاتە پێغەمبەر ناسی‌و ئنجا بـە هۆی ناسینی پێغەمبەرو شوێن کەوتنی‌یەوە ئاستی خواناسی‌و خوا پەرستی‌یەکەی بەرەو زوور دەچێت ، ئنجا هەتا پتر خوا بناسێ‌و بی پەرستێ‌و یادی بکات ، ئاستی خۆشەویستی‌ی سەبارەت بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم پێهەڵا دەچێ‌و زیاتر بەڕێ‌و شوێن‌و ڕەوشت‌و ئاکاری‌یەوە پابەند دەبێت‌و ، دیسان ئەمەش کار دەکاتە سەر ئاستی خوا ناسی‌و وەهەروەها •••

هەڵبەتە لـە ئەنجامی خوا ناسی‌و پێغەمبەر ناسییش‌دا دەگەینە دوا ڕۆژ ناسی ( علم المعاد ) •

کەواتە : یادی خوا پەیوەندی‌یەکی پتەوی لەگەڵ هەرسێک بنچینە سەرەکی‌یەکانی ئیسلام‌دا هەیە ، بانی : خواناسی‌و پێغەمبـەر ناسی‌و دوا ڕۆژناسی ، ئەو پەیوەندی‌یەش پەیوەندی‌یەکی ڕاستەوانە (طردي)یە(٩) •

---

(٩) پەیوەندی ڕاستەوانە ( طردي ) لە نێوان دووشت‌دا ئەوەیە کەهەتا یەکیان زیاد بکات ئەوی دیکەشیان زیاد بکات ، وە بە بەراوەژووەوە بەڵام پەیوەندی پێچەوانە ( عكسي ) ئەوە بە پێچەوانەوە زیاد بوونی هەرکامێکیان دەبێتە هۆی کەم بوونی ئەوی کەم بوونیشی دەبێتە هۆی زیاد بوونی •

جا خوایە یارمەتیمان بدە هەمیشە یادی تۆمان لە سەر دڵو زمانان بێتو هەرچی زیاتریش سوننەتو ڕێو شوێنی پڕ پیتو پیرۆزی سەرەخێری پێغەمبەری هەردەم خوا لەیادو تێکۆشەرمان صلی الله علیه وسلم لەبەر چاوان بێ • ئامین •

## بەشی سێیەم

# پەیوەندی نێوان یادی خواو دوورکەوتنەوە لە تاوان

خوا لە یاد بوون دەبێتە هۆی بەریزرانی مرۆڤ لە تاوانو سەرپێچی، خوای بێ هاوڵو بەخندە لەو بارەوە فەرموویەتی : [ واما ینزغنك من الشیطان نزغ فاستعذ باللە انە سمیع علیم • ان الذین اتقوا اذا مسهم طائف من الشیطان تذكروا فأذا هم مبصرون • ] الاعراف – ٢٠٠ ، ٢٠١ •

واتــە :

وە ئەگەر خوتخوتەیەکت[١] لە خوتخوتە ( وەسوەسە ) شەیتان هاتە دڵ ، پــەنا بەرە بەرخوا ، چونکە ئــەو یەکجار بیسەرو زانایە • ئەوانەی پاریز کارن هەر کاتێک دنەدانو[٢] خوتخوتەیەکیان لە شەیتانەوە نووش بوو ، یــەکســەر خــوایان[٣] دێتــەوە یادو چاوــی دڵــیان

(١) ( معجم مفردات الفاظ القرآن ) ص٥٠٨ ، وەتەفسیری ( مدارك التنزیل ) وە ( الخازن ( ج٢ ص١١٧ ، دیسان ( ابن كثیر ) ج٢ ص٢٧٨ •

(٢) ( البیضاوي ) ج١ ص٣٨٢ ، وە ( مختصر تفسیر الطبري ) ص١٩٤، وە ( مدارك التنزیل ) ج٢ ص١٧١ •

(٣) ( بیضاوي ) ج١ ص٣٨٢ ، وە ( مدارك ) ج٢ ص١٧١ ، وە ( مختصر تفسیر الطبري ) •

تێبینی : مەبەستم لە دەست نیشان کردنی ئەو سەر چاوانە ئەوەیە کە ئەو چەمكو مانایەی لە ئایەتەکانی وەردەگرم لەو سەرچاوانەدا هاتوە •

•کرێتەوەو دەبنن – خەریکی چین – •

•• کەواتە : تاقە چەکێك کەمرۆڤ بتوانێ بەرگری پێ لە خۆی بکات لە بەرانبەر وەسوەسەو شەنانەدا بریتیە لە یادی خودا !

دەبینن لــە ئایەتی یەکەمدا خوا فەرمانمان پێدەکات کە لەدەمی بەدڵدا هاتنی حوتخوتەو بیری خراپ لەلایەن شەیتانەوە ، پەنا بەرینە بەر وی ، واتــە : لــە دەمی ئاراستەکرانو هاویشترانی تیری وەسوەسەی شەیتاندا بەرەو ئامانجی دڵ ، یادی خوا بکەینە سوپەرو قەڵغانو دڵمانی پێ بپارێزین •

لــە ئایەتی دووەمیشدا ڕوون کراوەتەوە کــە هەرکاتێك شەیتان ویستی توخنی بابای خوا ناسو پارێزکار[٤] بکەوێو بچێتە نێو قەلای دڵیەوەو ، بۆ خراپە هانیداو بەرەو تاوان تاوی دا ، چونکە هەمیشە یادی خوا دەکەن ، لــەو دەمەی دا خوایان دەکەوێتــەوە یادو دوای ئــەوەی شەیتانی بەد خەریك بوو بیانخاتە نێو شەوەزەنگی تاوانو سەرلێنچی یەوە، بە هۆی یادی خواوە دەکەونە نێو ڕووناکیو دەوروپشتی خۆیان دەبیننو، لەفێڵو پیلانی شەیتان ئاگادار دەبنو ، لە خەوی بێ ئاگایی بێدار دەبن •

هەر ئــەم ڕاستی یەی ئێستا گوتمان لــە جێیەکی دیکەی قورئاندا

---

(٤) [ التقوی ] : جعل النفس في وقاية ممـا يخاف ، وفي اصـطلاح الشرع : « حفظ النفس عمـا يؤثم » • واتــە : مانای ( تقـوی ) پارێزکاری لە زماندا : خۆ پاراستنە لەو شتانەی کەجێی مەترسیین، لە زاراوی شەرعیشدا بریتیە لە خۆ پاراستن لەو شتانەی کــە مرۆڤ پێیان تاوانبار دەبێت ، [ معجم مفردات الفاظ القرآن ] راغب الاصفهاني ص٥٦٨ •

باشتر ڕوون کراوەتەوە : [ قل أعوذ برب الناس ، ملك الناس ، اله الناس ، من شر الوسواس الخناس الذي يوسوس في صدور الناس من الجنة والناس • ] الناس •

واتە :

بڵێ پەنا دەبەمە بەر پەروەردگاری خەڵکی ، سەرۆک و گەورەی خەڵکی • خواو پەرستراوی خەڵکی : لە شەڕو خراپەی شەیتانی دنەدەری خۆ پەنهان کەر ، ئەوەی کە خوتخوتەو بیرو خەیاڵی خراپ دەخاتە نێو سینەو دڵی خەڵکی ، ـ ئەو شەیتانەش ـ لە مرۆڤ و پەری ( جن )یە •

ئەوەی لێرەدا جێی سەرنج و تێوە ڕامانە ، پێناسە کردنی شەیتانی دنەدەرو خونخەتە کەرە ، بە وشەی : [ الخناس ] ، جا با بزانین زانایانی ویژەرەوەی قورئان چۆن باسی ئەم وشەیەیان کردوە :

١ ـ ( راغب الاصفهاني )[٥] گوتوویەتی : [ قوله تعالى : [ من شر الوسواس الخناس ] اي الشيطان الذي يخنس اي ينقبض اذا ذكر الله تعالى ، وقوله تعالى : [ فلا اقسم بالخنس ] اي بالكواكب التي تخنس بالنهار •• ] •

واتە :

قسەی خوای بەرز کە دەڵێت : « من شر الوسواس الخناس » یانی : ئەو شەیتانەی کە خۆی دەشارێتەوە ـ یانی خۆی ڕێك دێنێ ـ لە دەمی

(٥) ( معجم مفردات الفاظ القرآن ) ص١٦١ •

یادکرانی خوای بەرزدا ، وەقسەی خوا کە دەڵێت : « فلا اقسم بالخنس »
ی ، سوێند بەو خڕۆکانەی کە لە ڕۆژێدا خۆیان پەنهان دەکەن .

٢ – ( ابن جرير الطبري )[٦] دەڵێت : [ الخناس : الذي يخنس يرجع ) مرة ويوسوس اخرى ، ونما يخنس عند ذكر العبد ربه . ]

واتـە :

« الخناس » ئەوەیە کە جارێکی خۆی ون دەکاو دەگەڕێتەوە ، وە جارێك وەسوەسە دەکات ، وەنەبێ کاتێك دەگەڕێتە دوایەو خۆی پەنهان دەکات ، کە بەندە یادی پەروەردگاری خۆی دەکات .

هـەڵبەتە هـەرکام لـە « ابن[٧] كثير ، فخـرالدين[٨] الرازي ، بيضاوي[٩] ، نسفي[١٠] ، خازن[١١] ، جلالين[١٢] ، في ظـلال[١٣] لقرآن » هەمان قسەیان کردوە دەربارەی وشەی ( الخناس ) .

هەر لەم بارەوە ( ابن عباس ) بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی : [ الشيطان جاثم على قلب ابن آدم ، فاذا ذكر الله تعالى خنس ، واذا غفل وسوس ] رواه البخاري معلقا .

---

(٦) مختصر تفسير الطبري ص٢٠٧ .
(٧) تفسير ابن كثير ج٤ ص٥٧٥ .
(٨) التفسير الكبير ج١٦ جزء ٣٢ ص١٩٧ .
(٩) البيضاوي ج٢ ص٥٨٤ .
(١٠) المدارك ج٤ ص٤٦٢ .
(١١) المدارك ج٤ ص٤٦٢ .
(١٢) الجلالين ج٢ ص٥٨٤ .
(١٣) في ظلال القرآن / الشهيد سيد قطب ج٨ ص٧١٣ .

واتــە : شەیتان لــە سەر دڵی ئادەمزاد چۆکی داداوە ، جا ئەگەر یادی خوای بەرزی کرد دەکشێتەوە ، وەئەگەر ـ لە خوا ـ بێ ئاگا بوو وەسوەسە دەکات .

کەواتــە :

کێ دەیەوێ شەیتانی بەدو نەفرین کراو بە سەر دڵو دەروونیدا زاڵ نەبێو ، قەڵای دڵی داگیر نەکات ، با هەمیشەو دایم ودەرەم خوای لە یاد بێت ، چونکە هەر دڵو دەروونێك بە تیشکی ڕۆژی بڕوا بە خوا بوونو یادی خوا ڕووناك بووبێتەوە ، هیچ حەشارگەو نەدیوو پــەناو پەسیوی تێدا نامێنن کە شەیتانی نەگبەتو بێ خێر ، خۆی تێدا مەڵاس داو سەنگەری تێدا لێدات ، بەڵێ شەیتان وەك شەمشەمە کوێرە وایەو لە دڵو دەروونی تاریكو تەڵەمو پڕ ژەنگو ژاردا نەبێ ناتوانێ مەدار بکاو ، هــەر دڵێك یادی خــوای تێدابێت ، چــاری ناچارە دەبێ لێی بگوازێتەوەو بار بکات .

ئێنجا باکۆتایی ئەم باسە بە گێڕانەوەی بەسەر هاتێکی بایەخ دار بێنین کە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بۆی گێڕاوینەوە بەڵام لــە بــەر درێژی یەکسەر وەری دەگێڕمو دەقە عارەبی‌یەکەی نانووسین ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :

[ خوا پێنج شتی بە یەحیای کوڕی زەکەریا ڕاگەیاندن ، کە بۆ خۆشی ئیشیان پێ بکاتو فەرمان بە گەلی ( بني اسرائيل )یش بکات ، کەجێ بەجێ‌یان بکەن ، بەڵام وەك شتێك یەحیاستی نواند لەوبارەوە . ( عیسی ) هاتە لای پێی گوت : خوا فەرمانی پێ کردووی بە جێ بەجێ کردنی پێنج شتان ، وە فەرمانی پێ کردووی بە ( بني اسرائيل )یشیان

ڕابەبەیەنی بیانکەن ، جا یان دەبێ پێیان بلێی یان من هەوالیان دە دەمێ ، یەحیا ئوتی : برای خۆم وامەنە ، چونکە دەترسم ئەندر لە پێش‌مندا بەو ئارە هەستی ، یان بەزەویدا ڕۆبچم یان سزا بدرێم .

ئنجا ( بني اسرائيل )ی لە ( بيت المقدس )دا کۆ کردەوە ، هەتا مزگەوت پڕ بوو ، وە لەسەر ئەو شوێنانەش دانیشتن کە بە سەر مزگەوتێ‌یاندا دەڕوانی ، دوایی وتاری بۆدان ، ئوتی :

خوا پێنج شتی پێ ئوتووم کە بۆ خۆشم ئیشیان پێ‌بکەم وە فەرمان بە ( بني اسرائيل )یش بکەم ئیشیان پێ‌بکەن :

یەکەم :

هیچ شتێک مەکەنە هاوتاو هاوەلی خوا ، چونکە ئەوەی کە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێ ، وەک ئەوە وایە پیاوێك بەس بە ماڵی خۆی ـ زێر بێ یان زیو ـ کۆیلەیەک بکڕێو لە خانوێکدا نیشتە جێی بکات ، دوایی پێی بلێ : کار بکەو پارەکەی بدە بەمن ، ئنجا ئەویش دەستی بە کار کرد ، بەلام پارەکەی دەدا بە یەکی دیکە نەک بە گەورەکەی ، جا کامەتان ڕازی دەبێ کۆیلەکەی وابێ ؟!

هەر خوا دروستی کردوون‌و ڕۆزیتان دەداتێ ، کەوابێ هیچ شتێك مەبەنە ڕیزی خواو مەیکەنە هاوتای وی .

دووەم :

وەئەگەر بۆ نوێژێ هەستان ، لە نوێژێدا ئاوڕ مەدەنەوە ، چونکە ـ لە نوێژێدا ـ خوا ڕووی خۆی دەکاتە بەندەی مادام ئاوڕ نەداتەوە بەم لاو لادا .

سێیەم :

وە فەرمانی پێ کردوون بە ڕۆژوو گرتن ، ئەوەش وەك ئەوە وایە کە پیاوێك لە نێو کۆمەڵێکدا یەو پرێسکەیەك بۆنی خۆش ( مسك )ی پێیە ، هەر کامێکیان حەز دەکات بۆنی بکا ، وە ڕۆژووش لە کن خوا بۆنی ( مسك ) خۆشترە •

چوارەم :

وە فەرمانی پێ کردوون بە ماڵ بەخشین ، ئەوەش وەك ئەوە وایە پیاوێك بەدەستی دوژمن بەدیل بگیرێ دەستی لـە گەردنی ببەستن و بیهێننە پێشەوە تاکو لە گەردنی بدەن ، ئەویش دەڵێت :

دەڵێن چی خۆمتان لێ بکڕمەوە ؟! ئنجا هەرچی هەیەتی دەیانداتێ هەتا خۆی دەکڕێتەوە

پێنجەم :

وە فەرمانی پێ کردوون کە زۆر یادی خوابکەن ، ئەوەش وەك ئەوە وایە ، دوژمن بە تاڵووکە وەدوای کابرایەك بکەوێ ، هەتا خۆی دەگەیەنێتە قەڵایەکی مەحکەمو قایمو خۆی تێدا مەڵاس دەدات ، هـەر ئاواش بەندە لـە چنگ شەیتان قوتار نابێ بە بێ یادی خوا • ] رواه الترمذي • رياض الجنة : الشيخ عبدالحميد كشك •

# بەشی چوارەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو ئارامی دڵو دەروون

یادی خوا دەبێتە هۆی ئارامی دڵو دەروونو پەیدا بوونی دڵنیاییو ئۆخژنو پەرامەندی لە دڵی مرۆڤدا ، خوای بێ وێنە لەو بارەوە فەرموویەتی : [ الذين امنوا وتطمئن قلوبهم بذكر الله الا بذكر الله تطمئن القلوب • ] الرعد – ۲۸ •

واتە :

ئەوانەی بڕوایان هێناوەو بە یادی خوا دڵیان ئارام دەگرێ ، بزانن کە بە یادی خوا دڵان دادەمرکێنو ئارام دەگرن •

بەڵێ هەر وەکو چۆن کۆرپە لە باوەشی دایکیدا دەسرەوێو دڵی ئاسوودە دەبێو ، ڕووەک بە ئاودانو تیشکی خۆر دەگەشێتەوەو دەبووژێتەوەو ، ئەویندار لەدەمی دیتنی خۆشەویستەکەیدا کەیفو سادی دڵی پڕ دەکو شا بەسەپانی خۆی ئازانێ ، بابای خواناسو مسوڵمانیش لە کاتێکدا سەرگەرمی یادی خواو ڕازونیاز لەگەڵ کردنی دەبێت ، دڵی بە تیشکی تەجەللای جوانیو سامو هەیبەتی خوا پڕ پڕ دەبێت لە ئارامیو ئۆخژنو ڕازی بوونو دڵنیاییو هەست کردن بە عیززەتو سەر بەرزیو ئازایەتیو بە جەرگیو غیرەت •

خوا لە جێیەکی دیکەدا فەرموویەتی : [ يا أيها الذين آمنوا اذكروا

الله ذكرا كثيرا ، وسبحوه بكرة واصيلا ، هو الذي يصلي عليكم وملائكته ليخرجكم من الظلمات الى النور وكان بالمؤمنين رحيما • ] الاحزاب ـ ٤١ ، ٤٢ •

واتـه :

ئـەی بڕوا دارینە ! یادی خـوا بکەن ، یاد کردنێکی زۆر ، وە بەیانیانو ئێواران پاكو بێگەردی بۆ دەربڕن ، ـ خوا ـ ئەو کەسەیە کە بەزەیی خۆیتان بۆ سەر دەنێرێو فریشتەکانی داوای لێ خۆشبوونتان بۆ دەکەن ، تاکو لە تاریکاییەکان بتان هێنێتەدەر بۆ ڕووناکی ، وەخوا سەبارەت بە بڕواداران زۆر بەخشندەیە •

وەك دەبینین یادی خوا دەبێتە هۆی داباربنی بەزەیی خواو دوعای فریشتانو ، ڕزگار بوون لە تاریکیو چوونە نێو ڕووناکی !

بێگومان هەر کام لە مانەش دەبنە هۆی هێنانەدی سێبووری هاتنو دڵارامیو ئاسوودیی گیان •

دیسان خوای قسە لەجێ دەفەرموێ : [ ألم يأن للذين آمنوا ان تخشع قلوبهم لذكر الله وما نزل من الحق ، ولا يكونوا كالذين اوتوا الكتاب من قبل فطال عليهم الاحد فقست قلوبهم وكثير منهم فاسقون • اعلموا ان الله يحي الارض بعد موتها قد بينا لكم الآيات لعلكم تعقلون • ] الحديد ـ ١٦ ، ١٧ •

واتـه :

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کە بڕواداران بە یادی خواو بەو بەرنامە ڕاستەی کە ناردوویەتی دڵیان نەرم بێ ! وە بە مەرجەدی ئەوانە نەچن

که لەوە پێش کتێبیان پێ درابوو ـ وەک جوولەکەو دیانەکان ـ بەڵام دوای ماوەیەکی درێژ خایەن دڵیان ڕەق بوو ، وەزوور بەشیان تاوانبارو لارێ بوون • بزانن کـه خـوا پاش مردن زەوی زیندوو دەکاتەوە • [ واتـه دوای وشک بوونی ڕووەکو شیاوردەکەیو ڕەق هـەڵاتنی ] ئەوە بەڵگەو نیشانەکانمان بۆ خستنە ڕوو بەشکم ـ لە ڕاستی ـ تێبگەنو حالی بن •

کەواتە : یادی خوا دەبێتە هۆی دڵنەرمیو چاکە کردنو ، لە خوا بێئاگاییو دوورە پـەرێزیش لـە یادی خـوا دەبێتە مایـەی دڵڕەقیو تاوانباری •

ئنجا هەروەک چۆن یادی خوا دەبێتە هۆی دڵارامیو سێبووری هاتنو دڵنیاییو داباریني بەزەیی خواو دوعا بۆ کردنی فریشتانو لـە تاریکی قوتار بوونو چوونە نێو • ڕووناکی ، بە بەراوەژووەوە دوور کەوتنەوە لە خواو دوورە پەرێزی لە یادی خوا دەبێتە هۆی پەیدا بوونی سەرگەردانیو دڵە ڕاوکێو نا ئاسوودەییو گوێ پێنەدانی خواو لـە شەیتان نیزیك بوونەوەو بـەدبەختیو چارە ڕەشی سەر بەهەشتیو بێ بەشی !!

بۆ نموونە خوای بێ هاوەڵ فەرموویەتی : [ ولا تكونوا كالذين نسوا الله فأنساهم انفسهم اولئك هم الفاسقون • ] الحشر ـ ١٩ •

واتـە :

وە وەکو ئەوانە مەبن کەخوایان لە یادچۆوە ، ئەویش خۆیانی لە بیر بردنەوە ، هەر ئەوانەن لە ڕێ دەرچووان •

بەڵێ بەڕاستی کەسێك خوای لە بیر بچێتەوەو یادی نەکات ، خواش لە تۆڵەی ئەوەدا ، وای لێ دەکات خۆی لە بیر بچێتەوە ، واتە دەکەوێتە ئێژی دەریای بێ ئاگایی یەوەو بەرژەوەندیو زیانی خۆی نازانێو سەرکەردانو داماو دەبێ •

دیسان لە جێیەکی دیکەدا دەفەرموێ : [ ومن يعش عن ذكر الرحمن نقيض له شيطانا فهو لـه قرين ، وانهم ليصدونهم عن السبيل ويحسبون انهم مهتدون • ] الزخرف – ٣٦ ، ٣٧ •

واتـە :

وە هەر کەسێك لە ڕاست یادی خوادا (أ) کوێر[١] بێ ، شەیتانێکی بۆ ساز دەکەین ، دەبێتە هاوەڵیو لێی جوێ نابێتەوە ، وەئەو شەیتانانە هاوەڵەکانیان لەڕێی ڕاست لادەدەن ، بەڵام – هەست بەلادانو لاڕێ بوونی خۆیان ناکەنو – وا گومان دەبەن کە ڕێی ڕاستیان گرتوە •

جا وای بە حاڵی ئـەو کەسەی دەبێتە برادەرو دۆستی شەیتان ! زۆری تووشی هەزار جۆرتمی ... ئاو پێی لە هەزار قوڕاوی دەدات !!

خوێنەری خۆشەویستم با جارێکی دیکە سەرنجێکی قووڵ لـەو دەقانە بدەین :

---

(١) [ معجم مفردات الفاظ القرآن ] ص٣٤٧ ، ٣٤٨ ، بـەڵام طبـري گوتوویەتی : ( يعش : يعرض ) واتە : ( يعش ) یانی پشتی تێ کردو گوێی نەدایە ، بەڵام لە ئەنجامدا هەردوو ماناکە هـەر یەکن ، چونکە کەسێك چاوی دڵی کوێر نەبووبێت پشت ناکاتە یادی خواو بەرنامەکەی [ مختصر تفسير الطبري ] ص٥٥٧ •

لە دەقی یەکەمدا ڕاگەیەندراوە کە یادی خوا دەبێتە هۆی پەیدا کردنی ئارامیی و دڵنیاییی و تەسکینی دڵ ، کەواتە بێ ئاگایی لـە خوا ، دەبێتە هۆی پەیدا کردن و ڕەخساندنی « دژی ئارامی » لە دڵ و دەروونی مرۆڤدا ، واتە ، یاد نەکردنی خوا ماک و میکرۆبی هەرکام لە دڵە ڕاوکە « قلق » و خۆ ڕانەگری و بێ هیوایی و ترس و بێ هێزی یە .

لە ئی دووەمیشدا دەردەکەوێ ، کە ئەوانەی زۆر یادی خوا دەکەن و لێی بێ ئاگا نابن ، خوای بەرز بەزەیی ان بەسەرا دەرێژێ و فریشتەکان داوای تاوان پۆشی و لێبوردنیان بۆ لەخوا دەکەن و ، لە تاریکایی یەکان قوتار دەکرێن و دەبرێنە نێو ڕووناکی یەوە ، بەڵێ بەڕاستی پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خواو یاد کردنی خوا ، مرۆڤ لە هەموو جۆرە تاریکی یەك ڕزگار دەکات ، لە تاریکی بیرو بۆچوونە چەوت و نالەبارەکان ڕزگاری دەکات ، کە بریتین لە هەموو ئەو بیرو بۆچوون و بیر دۆزانەی کەزادەی بیرو هۆش و هەواو ئارەزووی مرۆڤن بۆ نموونە : کاپیتالیزم و کۆمۆنیزم و ناسیۆنالیزم و ئەگزیستانسیالیزم و مارکیوزیسم فرۆیدیزم و داریونیزم و .. هتد ، کە پێکڕایان هەڵقوڵاوی وڵاتە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژ ئاوایی یەکانن .

وە ڕزگاری دەکات لە شەو ، زەنگی ڕەوشت نزمی و ئاکار بەدی و بێ بەندو باری و کەج ڕەفتاری و تالە باری ، کە لە ئاکامی دوور کەوتنەوە لە ئیسلام و پاڵاو بوونەوەی بیردۆزە قڕێژکە مرۆڤکردە شەیتانی یەکاندا پەیدا دەبێ .

وە ڕزگاری دەکات لەوەی کە هەر ڕۆژە بەدەهۆڵێك هەڵبەڕێ و بە ئاوازێك گەرم بێ ، کە بێجگە لـە ماندوو بوون و ئارەق ڕشتن هیچی پێگەی لەو هەڵپەڕین و داپەڕین و هاتن و چوون و جەزبە گرتن و گـەرم

بوونە دەستگیر نابێ •

---

وە ڕزگاری دەکات لەوەی ئەوەک نەخۆشێکی فرزە لێ بڕاوو بێ حاڵ هەرڕۆژە کۆلکە برین پیچێکی ناکارامەو نەشارەزا خۆی لێ بکاتە لوقمانی حەکیمو یەکێکیان چەقووی تێدا بە کاربێنێو ، ئەوی دیکە بڵێ ئی پێشێ نەیزانیوەو ، کەچەمووسێکی لێ وەکار خو ، یەکی دیکە کولە مفەستێکی ژەنگاویو وەهەروەها !!

وەڕزگاری کات لەوەی کە ڕۆژ بۆ ڕۆژێ بە هۆی ڕێنجکەی سەیتانیو بەپێی نەخشەو پیلانی ئیمپریالیزمی جیهانخۆر نەتەوەکەی پتر پارچە پارچەو کوت کوت بێت !

وە لە کۆتاییدا پەیوەندی بوون لەگەڵ خواو یادی خوا ، مرۆڤی مسوڵمانو گەلی مسوڵمان ڕزگار دەکات ، لە تاریکیو شەوە زەنگی چەوسێنرانەوە بە دەست هەر ڕژێمێکی ستەمکاری خۆسەپێنەری بێدینی لاڕێ !!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خواو یادی خوا ، وا لە مرۆڤی مسوڵمان دەکات کە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام ، هەڵبەتە کاتێکیش مرۆڤ دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام لە هەموو ئەو تاریکاییانەی گوتمانن ـ زۆری دیکەش کە نەمان گوتوون ـ ڕزگاری دەبێتو شیفاو هەتوانی هەموو برینەکانی دەستگیر دەبێو ، لە بن باڵی بەزەیی خواو لە ژێر سێبەری بەپیتو پێزو سەر بەخێری بەرنامەکەیدا دەسرەوێو ئاسوودە دەبیت •

واتە : قورئان گوتەنی : هەر وەک چۆن بابایەک کە لە نێو چەند

جۆرە تاریکی‌یەکدا گیری خواردوەو سەرسامو دەستەوسان بووەو دوایی خوا ڕەحمی پێ دەکاو بەرەو ڕووناکی دەبات ، چەند هەست بە ئارامی‌و خۆشبەختی‌و ڕەزامەندی‌و دڵنیایی دەکات ، مرۆڤی مسوڵمانیش ئاوا .

لە دەقی سێ‌یەمیش‌دا خراوەتە ڕوو ، کە یادی خوا :

دەبێتە هۆی دڵنەرم بوونو ڕوو لە چاکە کردن ، وە بەپێچەوانەوە .

لە ئاکامی یاد نەکردنو بێ ئاگایی ( الغفلة )دا ، دڵی ئینسان ڕەقو تەق دەبێ‌و دەبێتە شتێکی نەگبەتو بێ خێر .

بەڵێ دڵی مرۆڤی خوا لەیادو خوا پەرست وەک زەوی‌یەکی نەرمو بەپێز وایە ، هەروەک چۆن زەوی نەرمو بە پێز ئەو ئاوە هەڵدەمژێ کە بەسەری‌دا دەبارێ‌و دوایی ڕووەکو شیناوردی تێدا دەڕوێ ، دڵی بابای خوا ناس‌و خوا لە یادیش ئەو ڕێ‌ڕوونی‌و ئامۆژگاری‌یانەی کە بە سەری‌دا دەخوێندرێنەوە ، وەریان دەگرێ‌و دوایی ئەو دڵە کە بەتیشکی یادی خوا ڕۆشن بۆتەوە ، دەبێتە زەمینەیەکی لەبارو گونجاو بۆ تێدا ڕووانی هەموو جۆرە کردارو گوتارێکی مسوڵمانانە .

بەڵام دڵی مرۆڤی لەخوادوورو بێ ئاگا ، وەک زەوی‌یەکی ڕەقەن‌و بێ پیت وایە کە لە بەر ڕەقی‌و بێ پیتی توانای هەڵمژین‌و هەڵگرتنی ئەو ئاوەی نیە کە بەسەری‌دا دەڕژێ‌و هەر بۆیەش هیچی چاکی تێدا ناڕوێ .

ئنجا لە کۆتایی‌دا دەفەرموێ :

ئاگادار بن‌و بزانن کە خوای بەدەسەڵات ، هەروەك چۆن دەتوانێ

زەوی ئیشک هەڵگەڕاوو ڕووتەن ، بە هۆی ئاوی بارانەوە زیندوو بکاتەوە ، هەر ئاواش دەتوانێ بە هۆی ئەو بەرنامەو پەیڕەوەوە کە ناردوویەتی ، دڵانی مردووو ڕەق هەڵاتووو ئیشک زیندوو بکاتەوە .

لە دەقی چوارەم و پێنجەمیشدا ڕوون کراوەتەوە :

کە هەر کەسێک لە خوا بێ ئاگا بێ و لە یادی دوورە پەرێز بێ ، خواش گوێی ناداتێ و فەرامۆشی دەکاو ، وای لێ دەکات خۆی لە بیر بچێتەوە !

دیسان ڕاگەیەندراوە کە دڵ کوێر بوون و بێ ئاگابوون لە یادی خوا وا لە مرۆڤ دەکات کە شەیتانی بەد زەفەری پێ بەرێ و سواری بماتانی بێ و لەگەڵی ببێتە برادەرو هاودەمێکی گیانی بەگیانی ، ئنجا شەیتاز وا لەو برادەرو دۆستە فریو خواردوەی خۆی دەکات ، کە پەی بەنەزانی و سەر لێ شێواوی و لاڕێ بوونی خۆی نەبات و تووشی نەزانی ئاوێتە ( الجهل المركب )ی بکات و نەزانێ کە نازانێ !!

جا خوایە لە بێ ئاگایی و دوورە پەرێزی لە یادی خۆت بمانپارێزی ، بۆ وەی لە ئارامی دڵ و دەروون بێ بەش نەبین و شەیتان ڕێی تێمان نەچێ و دووچاری دڵە ڕاوکەو نەزانی ئاوێتە نەبین ئامین .

# بەشی پێنجەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو زاڵبوون بە سەر گیرو گرفتەکانی ژیاندا

شاعیرێکی فارس گوتوویەتی :

درین دنیا هیچکس بیغم نباشد اگر باشد بني آدم نباشد .

واتە : لەم جیهانەدا هیچ کەس بێ خەم نیە ، خۆ ئەگەر هەشبێ ئەوە ئەو کەسە ئادەمزاد نیە !!

بەڵێ ، ژیانی ئینسان لە سەر ئەم خرۆکەیە وا هەڵخراوەو سازکراوە، کە هیچ کەسێک بە تەواوی تیدا نەحەسێتەوەو ، ژیانی خاڵی نەبێ لە ئەرک و ئازارو ئێش وژانو دەردەسەری و کوێرەوەری و ڕەنج کێشان . خوای زانا لەو بارەوە فەرموویەتی : [ لقد خلقنا الانسان في كبد ] البلد ـ ٤ .

واتە :

بە ڕاستی مرۆڤمان لە نێو ڕەنجو ماندوو بوونو کوێرەوەریدا خوڵقاندوە ئێستا با سەرنجێکی قسەی توێژەرەوان بدەین سەبارەت بەوشەی ( كبد ) :

( طبري )[1] لەو بارەوە دەڵێت : [ والكبد : الشدة والمشقة ]
واتە : « الكبد » یانی : زەحمەت‌و گرانی‌و دەردە سەری •

( ابن عباس ) دەڵێ : [ لقد خلقنا الانسان في كبد ] يعني في نصب وقال : في شدة من حمله وولادته ورضاعه وفطامه ومعاشه وحياته وموته واصل الكبد الشدة ] •

واتە : یانی مرۆڤمان دروست کردوە لە ماندووەتی‌و ناخۆشیدا ، وە گوتوویەتی : [ في كبد ] یانی : لە زەحمەت‌و ناڕەحەتی ، لە زکی دایکی‌دا هەلگیرانی‌و ، لە دایک بوونی‌و شیر خواردنی‌و ، لە شیر بڕینەوەی‌و ، گوزەرانی‌و ژیانی‌و مردنی ، وە وشەی ( كبد ) لە بنەڕەتدا ناخۆشی‌و ناهەمواری‌و دەردە سەری‌یە[2] •

( راغب الأصفهاني ) دەڵێت :

[ كبد ] زەحمەت‌و ناڕەحەتی‌یە ـ خوا ـ فەرموویەتی : [ لقد خلقنا الانسان في كبد ] بۆ ئەوەی وریامان بکاتەوە ، کە خوا مرۆڤی جودا نابێتەوە ، هەتا ئەوکاتەی کە پردی سەرپشتی دۆزەخێ دەبڕێ‌و لە بەهەشتی‌دا جێ گیرو نیشتەجێ دەبێت[3] •

( المنجد )یش سەبارەت بە وشەی ( كبد ) هەمان قسەی وان دووپات دەکاتەوە[4] •

---

(١) ( مختصر تفسير الطبري ) ص٦٩١ •
(٢) ( تفسير الخازن ) ج٤ ص٤٠٧ •
(٣) ( معجم مفردات / الفاظ القرآن ) ص ٤٣٧ •
(٤) ( المنجد في اللغة والاعلام ) ط٢٢ ص٦٦٩ •

هەڵبەتە حیکمەتو هۆی سارکردنی دنیاو هەڵخستنی ژیانی مرۆڤ لەم سەر ەوی‌یە ، بریتیە لەوەی کە ئەم ژیانە بارو دۆخو دەورو بەرێکی لەبارو گونجاو بێت ، بۆ تیدا تاقی کرانەوەی مرۆڤ ، بەڵام ئیمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە ئەو باسە بتوێژینەوە(٥) ، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ، کە دەری خەین چۆنو کەنگێ مرۆڤ دەتوانێ بەرهەڵستی ئەو ئێش‌و ئازارو ڕەنجو کوێرەوەری‌یانە بکات کە لە ژیانی‌دا بەرۆکی پێ دەگرن !

وە چۆنو کەنگێ ئەو ناخۆشی‌و گیرو گرفتو کوێرەوەری‌یانە فرزە لە مرۆڤ دەبڕنو زیاتر تەشەنە دەکەنو ، هەر کامێکیان گەرای یەک یان چەندان دەردی دەروونی لە دڵی ئینسان‌دا دادەنێو ، دوایی بەهۆی ئەو گرێ کوێرەو دەردو نەخۆشی‌یە دەروونیانەوە چەندین دەردو نەساغی جەستەیی‌و ڕواڵەتییش پەیدا دەبنو پنجێ دەگرن !!

خوێنەری سەنگین !

لە ڕاسی‌دا بە هۆی هەبوونی ئیمانو پەیوەندی بەستن لەگەڵ خواو یاد کردنی خوا ، مرۆڤ دەتوانێ بە سەر گیرو گرفتەکانی ژیانی‌دا زاڵ بێت ، یان هەر نەبێ بەرهەڵستی ( مقاومة )یان بکاتو خۆی ڕاگرێ ، چونکە ئەو هۆیە سەرەکی‌یانەی کە دەبنە هۆی بەزینو خۆ ڕانەگرتنی مرۆڤ لە ئاقار تەنگو چەڵەمەو کۆسپو لەمبەرەکانی ژیان‌دا ئەمانەی خوارێن :

١ ـ هەست کردن بەتەنیایی‌و بێ پشتو پەنایی ٠

---

(٥) لە ( پوختەیەک )دا لە تەفسیری ئایەتی (٣)دا ئەو باسە توێژراوەتەوە ٠

٢ ـ بەبێ ئامانجو هیچو پووچ حسێب کردنی ژیان •

٣ ـ سەیر کردنی دیاردەی مردن وەک لە ناو چوونێکی یەکجاری •

٤ ـ ترسان لەداهاتوو •

٥ ـ ڕەش بینانە لێڕوانینی بوونەوەرو ژیان •

٦ ـ زۆر ڕۆچوون بەژیانی ماددیداو گوێ نەدان بەلایەنی گیانی •

٧ ـ بڕوا نەبوون بەپاك بوونەوەو هەست کردن بە تاوانباریو شەرمەزاری •

جا گومانی تێدانیە کە ئەم تێڕوانینو بیر کردنەوە هەڵانەش لە زەلکاوی بیری بێ بڕواییەوە سەر هەلدەدەن ، ئەواتە :

هەر کاتێک درۆزناوی بیرۆچکەی بێ بڕوایی چۆڕە بڕبێو وشک بێ مانای وایە : تێڕوانینە هەلەکانیش نامێنن •

بەڵێ بیرو بۆچوونو بیر کردنەوەو تێڕوانیی بێ بڕوایانە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی ئەو حەوت هۆیانەی کە گوتمان چاوکو سەر چاوەی بەزینو خۆڕانەگرتنو بێ هیواییو پشوو کورتیو نامەردیین •

ئێستاش با بۆ چاکتر ڕوون بوونەوەی مەبەست ، تێڕوانینو بیرو بۆچوونی دوو کەسی بێ بڕواو بڕوادار بخەینە ڕوو :

**یەکەم :**

تێڕوانینو بیر کردنەوەی مرۆڤی بێ بڕوا

---

[ بوونی ئێمە لە هەر دووک لای ڕابردووو داهاتووە وە پەیوەستە

بە نەبوون و خامۆشییەکی سامناکەوە ، بەر لە هاتنمان بۆ سەر شانۆی ئەم ژیانە دنیایییە بێجگە لە ئەندازەیەک ماددەو تۆخمی پرژو بڵاو چییەی نەبووین ، بە داهاتووشدا چارە نووسمان لە حاڵی پێش دروست بوونمان چاکتر نابێ !

چونکە دوای مردنێ کەسایەتی پێکهاتوومان لە مێشکی بەکارو بیری ڕووناک و هەستی بەرزو سۆزی نەرم و گۆشتی نەرم و جەستەی پێک و پێک و هەزارەها ئاوات و خولیای بەرز بەرز ، وەک گوڵکە زێڕینەیەکی نەخشێنراوو دڵفڕێن ، یان وەک بڵقی سەر ئاوی لە نێو دەچێ و ، لەگەڵ خاک و خۆڵدا ئاوێتە دەبێ و جارێکی دی چاومان بەدنیای ڕووناکی ژیان ناکەوێ و ڕێمان لە شاری بوون [ وجود ] ناکەوێ .

ئنجا پاش مردن چیمان بێ دەمێنێتەوە بێجگە لە چەند مستە گڵ و زەڕێکی پرژو بڵاو !!

بە ڕاستی ئێمە لە ئاقار دیاردەی مردندا وەکوو بازرگانێک واین ، کە لە بەر چاوی خۆی تێکڕای سەرمایەکەی دەسووتێنن و دوایی خۆشی دەخەنە نێو ئاگرەکەوە ! بێ ئەوەی هیچی لە دەست بێ .

ڕاستیت دەوێ ، هاتنی ئێمە بۆ ئەم ژیانە پارتەقای ئەرک و ئازارو ئێش و ژانەکەی ناوەستێ ، جارێ چەندان ساڵی بە بەر بێ هێزی و نەزانی تامی ژیان ناچێژین . ئنجا کە زل دەبین و پێدەگەین ، دەکەوینە نێو گێژاوی کار کردن و ماندوو بوون و ئێش و ژان و ڕۆزی وەدەست هێنان و خۆ ژیاندن و خێزان بەڕێوە بردن و هەست کردن بە بەرپرسیاری و دەردەسەری و نەخۆشی و دەردەباری ، هەر هێندە بەخۆ دەزانین ، ئەوە پیری و بێ هێزی بەرۆکی گرتووین و کەنەفت بووین و ماڵ و خێزان و

کۆمەڵگا لێمان بێزار بوونو ، خوا خوایانە زوو بچینە بیری مردنەوەو سەرو دڵیان بەردەین ، ئنجا هەر چەندە زانیاریو ئەزموونو پەندو فەلسەفەمان زۆر کۆ کردبێتەوەو دارایيو سامانمان زۆر وەسەرێک نابێ ، حەتمەن دنوەزمەی دزێوی مردن لە چەنکمانی دێنێتە دەرێو بەرەو مەمانی یەکجاری ڕەوان دەکرێینو ، لە نێو شەپۆلی بەتینو تاوی دەریای تاریکو پڕ مەترسی بوون ( وجود )دا ، وەک کۆلکە دارێکی بێ نەمیەت بە سەر قەڵبەزەی ڕووبارێکی بێڕەزاو بێ ئامانەوە ، ناوێکی کەم لەبەر چاوان دێینو دەچینو ، لە ناکامدا بەرەو دەریای زەبەلاحی نەبوون ( عدم ) دەچینو بێ سەرو شوێن دەبین !

وەک خەونێک کە بە خێرایی بە سەر ڕووبەڕی زەینی منداڵێکدا ڕەت دەبێ !!

لە ڕاستیدا نازانین بۆ چی هاتووینە ئێرەو لە بەرچی دەڕۆین ! وە بۆ کوێ دەڕۆین ؟

نە لە هاتنماندا پرسمان پێ کراوە ، وە نە لەڕۆیشتنماندا ڕاوێژمان پێ دەکرێ ، نەخێر لە ڕاستیدا سروشتی کەڕو کوێر ، هیچ ئامانجو مەبەستێکی نیەو ، وەك منداڵێکی گێلو نەزان یارییەکی ناماقووڵی دەست پێ کردوە ، هەرکە تەواو بوو تێکی دەداتو ، دووبارە دەست پێی دەکاتەوە ، موڕ بە سەرێو ماندوو بوونو دەردە سەرییەکەش بۆ ئێمەی مرۆڤی بەد بەختو چارە ڕەشو سەر بەهەشو بێ بەشە !! ]

**دووەم :**

**تێڕوانینو بیر کردنەوەی مرۆڤی بڕوادار**

[ ئەم کۆشکە ڕازاوەو ڕێک وپێکو پڕ وردەکارییە کە پێی

دەکوترێ بوونەوەر ( کون ) ، دروست کراوی بەدیهێنەرێکە کە بۆ مەبەستو ئامانجێکی دیاری کراو هێناویەتە دیو[6] بەردەوام سەرپەرشتی دەکات ، ئەو بەدیهێنەرە باڵ دەستو کار بەجێیە لە سۆنگەی ئەوەوە کەسەر چاوەی بوونە ، هیچ جۆرە پێویستی یەکی[7] بە ئێمە نیە ، بەڵکو ئەو بە مەبەستی تەواو کردنو کامل بوونو بەرەو زوور چوون ئێمەی خولقاندوە •

کەواتە : بەدیهێنەرێکی ئاوا ئەوپەڕی[8] بەخشندەییو چاکەو بەزەیی لەگەڵ مەدا نواندوە ، کە لە سەرچاوەی بوون ( وجود ) بەشی داوینو لە تاریکستانی نەبوون ( عدم )دەری هێناوین •

بەڵێ ئەو ئێمەی بەمەبەستی ژیانو کامڵ بوونو خۆ تەواو کردن هێناوەتەدیو ، ئەو هۆو ئامرازانەشی پێ بەخشیون کە سەرمان تێیان دەوەستێ لە ڕێی بەرەو خوا چوونو کامڵ بوونماندا •

وە ئێمە کە دووچاری دەردە سەریو گیرو گرفت دەبین ، یان لە سۆنگەی ئەوەوەیە کەبەیاساو دەستوورەکانی بوونەوەر شارەزانین ،

---

(6) [ وما خلقنا السموات والارض وما بينهما لاعبين ، ما خلقناهما الا بالحق ] الدخان ٣٨ ، ٣٩ •

واتە : ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان بە گاڵتە دروستمان نەکردوە ، دروستمان نەکردوون مەگەر بە هەق وڕاستیو بەحیکمەت •

(7) [ يا ايها الناس انتم الفقراء الى الله جميعا والله هو الغني الحميد ] فاطر ـ ١٥ •

(8) ( الرحمن الرحيم ) الفاتحة ـ ٣ • ( ورحمتي وسعت كل شيء ) الاعراف ـ ١٥٦ •

یان لە بەر ئەوەیە کە بەقەستی بەپێی ئەویاسایانە بەڕێوە ناچین[٩] •

بوونی ئێمە بوونێکی هەمیشەیی‌یەو زنجیرە قۆناغێکن بەدوای‌یەکسدا دێن ، وە ژیانی ئێمە بە مردن کۆتایی پێ نایەت‌و زنجیری تەمەنمان بە چوونە نێو گۆڕ نا پچڕێ •

لـە ڕاستی‌دا مردن بریتیە لـە کۆچ کردن‌و گواستنەوە لەم دنیـا تەسک‌و کەمبەرەوە بۆ جیهانێکی تەواو تڕو بەرین تر ، کە ئەم ژیانـە دنیایی‌یەمان لە چاو ژیانی وێ ، وەک ژیانی نێو منداڵدان ( رحم ) وایە لە چاو دنیادا[١٠] •

هەر چەندە ئێمە زانیاری‌یەکی بەر بڵاوو بێ سنوورمان نیە ، لـە هەموو نهێنی‌یەکانی بوونەوەر شارەزا نین ، بەڵام ئەوەندە هەیە ، دەزانین کە هەتا زانیاری‌و شارەزایی‌مان پتەوتر بچێ ، پتر ڕووی گەشاوەی ڕێک‌و پێکی‌و وردەکاری بوونەوەرمان لە بەر چاو دەدرەوشێتەوە[١١] ، تەواتـە : هیچ بەڵگـەیەک لە سـەر ئەوە نیە کە بەدیهێنەری بوونەوەر کەمترین تاڵێکی‌و بێ یاسایی تێکەڵ بە کارەکەی بووە[١٢] ، یان کەمترین بێدادی لەگەڵ دروست کراوەکانی‌دا کردوە •

بوونی ئێمە لە ئاقار بوونی خوادا بریتیە لە هیچ ( صفر ) ، بەڵام

---

(٩) ( ظهـر الفسـاد في البر والبحر بمـا كسبت ايدي الناس ٠٠ ) الروم ـ ٤١ •

(١٠) ( ومن ورائهم برزخ الى يوم يبعثون ) مؤمنون ـ ١٠٠ •

(١١) [ سنريهم آياتنا في الآفاق وفي انفسهم حتى يبين لهم انه الحق ] فصلت ـ ٥٣ •

(١٢) [ ما ترى في خلق الرحمن من تفاوت فارجع البصر هل ترى من فطور ؟ ] الملك ـ ٣ •

به مەبەستی وەنیزیک خستن لە بیرو زەینی هەندێک کەس ، دەڵێن :

ئەو نوزە ئاوەی کە باڵندەیەک بە دەندووکی هەڵی دەگرێو لە بەرزیی‌یەکی هەرە بەرزەوە فڕێی دەداتە نێو ئاوی زەریا ( ئۆقیانووس )ەکەوە ، سەبارەت بە ئاوی زەریایەکە چەندە ، ئێمەش سەبارەت بە خودای بێ وێنە هەر هێندەین •

کەواتە : خوای بەرزو زانا ئێمەی بۆ خزمەتو بەرزەوەندی خۆی نەخولقاندوە ، چونکە ئێمە هیچ نین تا ئەو سەری تێمان بوەستێ ، بەڵکو ئەو هەر بە بەر بەختیاری خۆمان خولقاندوینی • وەئەو بەرنامەیەش کە بۆی ناردوین ، بە بەڕێوە بردنی لەلایەن ئێمەوە هیچ سوودو قازانجێکی پێ ناگات ـ پاکی بۆوی ـ بەڵکو بۆیە ئەو بەرنامەیەی بۆ ڕەوانە کردوین تا لو بەدادگەرانە بژینو بتوانین ئەرکی جێنشینایەتی بەڕێوە بەرینو بەختیارو سەربەرزی ئەم دنیاو ئەو دنیابین • ]

**جا ئێستا خوێنەری بەڕێز !**

کێ هەیە بە بیرڕاینو بیرە بۆ بوونێکی بێ بڕوایانەوە لەگەڵ ئەو چەرمەسەریو گەرماو سەرماو تێس وژانی ژیانی دنیادا ڕوو بەڕوو بێو ، دڵو دەروونی نەبێتە زبڵدانی تێدا تروو کانی دەیان نەخۆشیو دەردی دەروونی ؟!!

کێ هەیە بە شێوەیەکی بێبڕوایانە سەیری ژیان بکاو هەست بە تەنیاییو بێ کەسیو بێ پشتو پەنابی نەکاتو ، لە داهاتوو نەترسێو لە دەمی بیستنی ناوی مردندا نەترەی نەچێو سپی نەبێ ؟!

بەڵێ بەڕاستی بێ بڕواییو لە خوا بێ ئاگایی ئامو چێژی ژیان

دەبات و پشووی مرۆڤ سوار دەکات و وای لێدەکات سەری دنیایەی لێ بەپووشێ بگیرێ و ، لەو دیو سووری ماددەو زیانی ماددی یەوە هیچ ئومێدو ترووسکاییەک بەدی نەکات لە لە جەنجەی سەرقالی زیانی دنیای دا ، دڵی خۆشکاو لە سەنگ و گێشی ئێش و ژان و دەردە سەرییەکانی زیانی دابشکێنێ و ، بارو کۆڵی قورسی زینی لەشان سووک بکات •

بەڵام بە پێچەوانەوە هەر کەسێک لە ڕوانگەی خواناسی یەوە تەماشای ژیان بکاو ، بەتێڕوانین و بیرکردنەوەیەکی بڕوادارانەوە لەگەڵ تاڵی و سوێری یەکانی دا ڕوو بەڕوو بێت ، قەت دڵی بێدارو هوشیاریی بەیادی خوا ، مەودا بەدیوەزمەی بەدی دڵتەنگی و پەژارەو دڵە ڕاوکەو گومان و ڕەشبینی نادات ، سواری شان و ملانی بێت و ، تووشی دەیان نەخۆشی دەروونی و جەستەیی بکات ، بەڵکو بابای بڕوادار تەنانەت مەینەتی و ئێش و ژان و ناخۆشی یەکانیشی ، لە سەر دڵ شیرین دەبن و ئەو چێژیان لێ وەردەگرێ و لێیان بێزار نابێت ، پێغەمبەری پێشەوامان صلی الله علیه وسلم لەو بارەوە فەرموویەتی : [ ما یصیب المسلم من نصب ولا وصب ولا هم ولا حزن ولا اذی ولا غم حتی الشوکة یشاکها الا کفر الله بها من خطایاه ] متفق علیه ، عن ابي سعید وابي هریرة / ریاض الصالحین ص۳۱ •

واتە :

هەر شتێك تووشی مسوڵمان بێت ، لە ماندوێتی و نەساغی و پەژارەو دڵتەنگی و ئازارو خەفەت ، تەنانەت چقڵ ( دڕک )ێک کە تێیرا دەچێ ! ئەوە خوا بە هۆی ئەوانەوە لە تاوانەکانی دەسڕێتەوە •

جا مرۆڤێك ئازارو دەردە سەریو گیرو گرفتەكانی ژیانی بنـەمایەی لە خوا بێزیك كەوتنەوەیو پاك بوونەوەی ، چۆن پێیان قەڵس نەبێو لێی دەبنە سندانو تووشی دەردو نەخۆشیی دەكەن ؟!

بەڵێ ، مرۆڤی موسوڵمانو خوا لە یاد پێی وایە ، كە بـە هۆی تەنگو چـەڵەمەو گرفتو ئازارەكانی ژیانییـەوە زیانی لێ ناكەوێ ، چونكە لە بەرانبەریاندا چاوی لە پاداشتە ، بەڵام مرۆڤی نا مسوڵمانو لە خوا دوور رۆر جێی خۆیەتی كە هەر ناگوزووریو نیگەرانیو دەردە سەرییەك ڕووی تێ كرد ، لە سەر دڵی ببێتە كرفتو گرێو سندانو مەركە مووشو نەخۆش ، چونكـە ئـەو هـەموو ناخۆشیو تـەنگو چەڵەمەیەكی ژیانی بـە زیان لێ كەوتنو ڕەنج بـەزایە چوونێكی بێ ئەنجامو ئامانج دێتە بەر چاو •

كەواتـە :

بەڵێ ڕاستە : یادی خواو پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوا چاكترینو بەهێزترین پشتیوانی مرۆڤە لـە ژیانیدا ، بۆ ئـەوەی بتوانێ بەرەنگاری گێرەو كێشەو ئێشو ژانەكانی ژیانی بێو بە سەریاندا زاڵ بێ •

وەبێ بڕواییو دوور لـە خوایی بنەڕەتی ترین هۆیە كـە مرۆڤی بێبڕواو خـوا نەناس بەرەو جڵێناوی خـۆ ڕانەگریو پشوو سواریو تەنگە پرێسكەییو بێ ورەییو ترسنۆكیو نامەردیو بێ جەوهەری • بەلكێش دەكات ، ئاخر بڕكە گوزاڵك هەر هێندەی لە باراندا هەیە كە قەلەفسان دەربكات •

جـا نازانم ئەوانەی لافی شۆڕشگێڕایەتیو گـەل ڕزگار كردنو وڵات ئازاد كردنو •• هتـد ئێدەدەن مەبەستیان جییە كـە خـەڵكی

بەرەو بیری بێ بڕوایی‌و بێ دینی بانگ دەکەن‌و هان دەدەن ! ، ئەو بیرە قرێژک‌و بێ خێرەی کە ماک‌و میکرۆبی دەردی ترسنۆکی‌و نامەردی‌و خۆ فرۆشی‌و بێ هۆشی‌یە ؟!

حەتمەن ئەو ماستە بێ‌موو نیەو ، دەبێ کوفری جیهانی کە لەم سەردەمەدا لە ڕژێمە شیوعی‌یەکان‌و ڕژێمە سەرمایە داری‌یەکاندا خۆی دەنوێنێ دەستی لەو کارەدا هەبێ !!

# بەشی شەشەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو پارێزران لە نەخۆشی دەروونی و جەستەیی

خوای بێهاوتا فەرموویەتی : [ ومن اعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكاً .. ] طه - ١٢٤ .

واتە : وە هەر کەسێك پشت لە بەرنامەی(١) من بکات ئەوە تووشی ژیانێکی سەختو تەنگو دژوار دەبێ(٢) .

ئەو سەختیو تەنگیو دژوارییەی کە بۆ مرۆڤی لاڕێ بووو لە خوا دوور دێتە دی ، سێ شتان هەڵدەگرێ :

١ - بێ ئارامی دڵو دەروونو هەست نەکردن بە ئاسوودەیی .

٢ - خۆ ڕانەگریو پشووکورتیو تێشکان لە ئاقار گیرو گرفتو کۆسپو تەگەرەکانی ژیاندا .

٣ - پەیدا بوونی چەندان نەخۆشی دەروونی کە بە هۆی وانیشەوە

---

(١) هەر چەندە وشەی ( ذکري ) دەگونجێ بە [ یادی من ]یش لێك بدرێتەوە بەڵام ئەگەر بەس بە ( بەرنامە )ش لێك بدرێتەوە ، هەر گونجاوە لەگەڵ مەبەستی ئێمەدا ، چونکە بەشێکی بەرنامەی خوا یاد کردنیەتی .

(٢) ( البيضاوي ) ج٢ ص٦٤ .

جەستە تووشی ژمارەیەک دەردو نەخۆشی دەبێت •

هەڵبەتە ئێمە لە بەشی چوارەمو پێنجەمدا سەبارەت بە خاڵی یەکەمو دووەم دواین ، لەم بەشەشدا بە پشتیوانی خوا خاڵی سێیەمیان دەتوێژینەوە •

بەڵام بەر لەوەی بچینە نێو ناوەڕۆکی مەبەستەوە ڕاستی‌یەک هەیە پێویستە ڕابگەیەندرێ :

لە ڕاستی‌دا خاڵی سێیەم ئەنجامێکی سروشتی‌و حەتمی خاڵی یەکەمو دووەمە ، واتە : لە ئاکامی نا ئارامی‌و تێشکاندا گەرای دەردە دەروونی‌یەکان لە دڵو دەروونی مرۆڤدا دەترووکێن‌و دەکەونە گەشە کردن ، ئنجا بە هۆی دەردە دەروونی‌یەکانەوە جەستەش نەخۆش دەبێ‌و پەکی دەکەوێ •

جا ئێستا دەتوانین بچینە سەر باسی ئەسڵی مەبەستو ، پێشەکی دەچینە خزمەت قورئان‌و فەرموودەکانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بزانین لەو بارەوە چ دەڵێن :

١ ـ خوای بەرزو بێ وێنە دەفەرموێ : [ ان الانسان خلق هلوعا • اذا مسه الشر جزوعا ، واذا مسه الخير منوعا ، الا المصلين الذين هم على صلاتهم دائمون •• ] المعارج ـ ١٩ ، ٢٠ ، ٢١ ، ٢٢ ، ٢٣ •

واتە :

مرۆڤ، خۆ ڕانەگر دروست کراوە ، کە خراپەو ناخۆشی‌یەکی تووش بوو ناڕەحەت دەبێ‌و ، وە هەڵبە دەکەوێ‌و ، کە خێرو خۆشی‌یەکیشی تووش بوو زۆر چرووکی‌و ڕژدی دەنوێنێ ، بێجگە لەو

نوێژکەرانەی کە لە سەر نوێژەکەیان بەردەوامن (٣) •

وەک دەبینین [ نوێژ ] کە گەورەترین درووشمی ئیسلامو باشترین جۆری پەیوەندی هەبوونە لەگەڵ خوادا ، بە مەرجێك وەك پێویست جێ بەجێ بکرێو بە بەردەوامی بەڕێوە ببرێ ، دەبێتە دەرمانو شیفای دوو جۆرە نەخۆشی دەروونی بەکجار بێرەزاو کوشندە ، یانی : خۆ ڕاسەکرێو هەڵپە هەڵپو پشوو کورتی ، وە ڕژدیو ماڵپەرستیو چرووکی •

٢ ـ وە دەربارەی دەغەڵ ( منافق )ەکان فەرموویەتی : [ مذبذبين بين ذلك لا الى هؤلاء ولا الى هؤلاء ـ ] النساء ـ ١٤٣ •

واتە :

ـ ئەو دوو ڕووانە ـ لەو نێوانەیدا دێنو دەچن ، نە بەلای ئەوانەدا خۆ ساغ دەکەنەوە ، وە نە بەلای ئەوان دا •

وەک دەبینین مرۆڤی بێ بڕواو لە خوا دوورو دەغەڵ ، بە هۆی پەیوەندی نەبوونی لەگەڵ خوادا ، دوو چاری ڕاڕاییو ئەملاو لا کردنو دڵە ڕاوکە دەبێت ، هەڵبەتە ئەمەش ترسناك ترین نەخۆشییە •

٣ ـ وە دەربارەی جوولەکە دڵنەخۆشەکان فەرموویەتی : [ لأنتم اشد رهبة في صدورهم من الله ذلك بأنهم قوم لا يفقهون ] الحشر ـ ١٣ •

---

(٣) ئەو تەفسیرەی ئێمە بۆ وان ئایەتانمان کرد ڕای هەموو توێژەرەوانی لەسەرە بۆ نموونە سەیری ( بيضاوي ) ج٢ ص٥٠٤ ، ( مختصر تفسير الطبري ) ص٦٥٥ ، ( في ظلال القرآن ) ج٨ ص٢٨٣ بکە •

واتــه :

ئێوه ـ ئەی مسوڵمانینە ـ لە خوا زیاتر جێی مەترسین لە دڵی وان ـ جووله‌که‌کان ـ دا ، ئەوەش لە بەر ئەوەیە کە ئەوانە کەلێکی بێ بڕوانو گەورەیی خوا نازانن(٤) •

بێگومان شتێکی بەڵگە نەویستە کە ترسان لە غەیری خوا پیس ترین نەخۆشی دەروونی یە کە لە ئەنجامی بێ بڕوایی‌و لە خوا بێ ئاگا بووندا تووشی مرۆڤ دەبێ ، کەواتە دەرمان وشیفای ئەم نەخۆشی یە ترسناکە بریتیە لە بڕوا بە خوا بوونو پەیوەندی بەستن لەگەڵ خوادا •

پێغەمبەری بەڕێزیشمان لەو بارەوە دەفەرموێ :

٤ ـ [ من كانت الآخرة همه ، جعل الله غناه في قلبه وجمع الله شمله وأتته الدنيا وهیَ راغمة ، ومن كانت الدنيا همه ، جعل الله فقره بين عينيه وفرق عليه شمله ولم يأته من الدنيا الا ما قدر له ] • رواه الترمذیّ / جدد حياتك : محمد الغزالی •

واتــه :

هەر کەسێك دوا ڕۆژ ـ واتە وە دەست هێنانی ڕەزامەندی خودا ـ ئامانجو مەبەستی بێ ، خوا دڵی دەوڵەمەند دەکات ، وە کاروباری بـۆ ڕێك دەخات ، وە دنیا ـ ڕۆژیو نازو نیعمەتەکانی ـ بە ناچاری دێتـه بـەر دەستی ، بەڵام هـەر کەسێك دنیـا ـو ئارەزووەکانی ـ ئامانجو مەبەستی بن ، خـوا هەژاری دەخاتە نێو چاوانی یەوە ، وە کارو باری

---

(٤) [ مختصر تفسير الطبري ] ص٦٢٧ •

بێ بڵاو دەکات ، وە دنیاشی نایەتە بەر دەست بێجگە لەوەی بۆی دیاری کراوە •

وەک دەبینین لە خوا دوور کەوتنەوەو دنیا پەرستی دەبێتە هۆی هەزاری دڵو ، بیرو زەین پەرتو بڵاو بوون ، چونکە مرۆڤ کە ئامانجی بوو بە ڕابواردنو کۆکردنەوەی دنیا ، قەت نیناتی نایەتو قەت هەست بە چاوتێری ناکات ، جا لە سۆنگەی ئەوەوە ناچار دەبێ بکەوێتە پەلە کوتە کردنو بیرو زەین بڵاو بوون بەملاو لادا •

بەڵێ بەڕاستی پیرە مێردی شاعیر ڕاستی گوتوە کە دەڵێ :

تەماع وەک ئاوی سوێری دەریایە

هەر دەیخۆیتەوەو تەسەلات نایە

٥ ـ دیسان فەرموویەتی : [ من أحب ان یکون أقوی الناس فلیتوکل علی الله تعالی ـ ] رواه ابن ابی حاتم •

واتە :

کێ پێی خۆشە بەهێز ترین کەس بێ ، با پشت بەخوای بەرز ببەستێ •

کەواتە : لە خوا دوور کەوتنەوەو بێ ئاگایی دەبێتە هۆی بێ هێزی مرۆڤ ، ئنجا تاقە شیفاو دەرمانی ئەم نەخۆشی‌یە کوشندەیەش بریتیە لە یادی خوداو ئیمانداریو پشت بە خوا بەستن •

٦ ـ هەروەها فەرموویەتی : [ ان العبد اذا أخطأ خطیئة نکت في قلبه نکتة سوداء ، فان هو نزع واستغفر وتاب صقل فان عاد زید فیها حتی

تعلو قلبه .. ] رواه ابن جرير والترمذي والنسائي وابن ماجه عن ابي هريرة . / في ظلال ج٨ ص٥٠٥ .

واتــه :

بەندە کە تاوانێکی کرد خاڵێکی ڕەشی لە دڵی دا پەیدا دەبێ ، جا ئەگەر وازی هێناو داوای لێبوردنی کردو گەڕایەوە ـ لای خوا ـ ئەوە دڵی سپیو ساف دەبێتەوە ، ئنجا ئەگەر دوایی گەڕایەوە ـ سەر تاوان ـ ئەوە لە خاڵە ڕەشەکانی دڵی زیاد دەبێ هەتا هەموو سەر دڵی دادەگرن .

کەواتە : تاوانباری کە بە هۆی لە خوا دوور کەوتنەوەوە پەیدا دەبێ ، دەبێتە هۆی نەخۆشی دڵ ڕەش داگەرانو دەروون ژەنگ هێنان ، ئنجا دەرمانی ئەو دڵ ڕەش داگەڕانەش بریتیە لە دوورە پەرێزی کردن لە تاوانو پەشیمان بوونەوەو تۆبە کردن ، یانی : پەیوەندی دامەزراندنەوە لەگەڵ خوادا .

جا خوێنەری بەڕێزو ئازیز :

ئێستا دوای ئەوەی کــه لــه دەلاقەی چەند دەقێکی ئیسلامییەوە سەرنجێکی سەر پێیمان لەو مەسەلەیەدا ، با بچینە لای زاناو پسپۆڕانی دەروونناسی بزانین لەو بارەوە چ دەڵێن :

**یەکەم : ویلیام جیمز :**

مامۆستای فەلسەفە لە زانکۆی ( هارفارد ) دەڵێت :
[ کاریگەر ترین دەرمانی ساڕێژ کەری خەمو پەژارەو نیگەرانی ،

بریتیە لەو عەقیدەو بڕوایەی کە ئایین فەرمانی پێ دەکات • ][5]

دیسان لە یەکێك لەو نامانەیدا کە بۆ برادەرێکی نووسوە دەڵێت :

[ هەتا ساڵەکانی تەمەنم ڕادەبرن ، کەمتر دەتوانم بەبێ بڕوا بەخوا ژیان بەسەر بەرم • ][6]

دەڵێت :

**دووەم : ریەوندبیچ :**

[ باب و دایکان و پەروەردەکەران پێویستە ئەوە بزانن کە لە پەروەردە کردنی منداڵدا ، ئایین گەورەترین یاریدە دەریانە ، بڕوار عەقیدە مەشخەڵێکە کە تاریکترین ڕێگا ڕووناك دەکاتەوە ، ویژدانەکان هەستیارو بێدار دەکات ، لە هەر جییەک هەر لاڕێ و سەرگەردانێك هەبێت ، زۆر بە ساناییی بەرەو ڕاستی و چاکە کردن ، ڕێ ڕوونی دەکات • ][7]

**سێیەم : دایل کار نیجی :**

نووسەری بە ناو بانگی ئەمریکایی دەڵێت :

[ ئەمڕۆ نوێ ترین زانیاری ، یانی : دەروونزانی ( علم النفس ) ئەو ڕێنموونییانە فێری مەردوم دەکات ، کە پێغەمبەران صلی الله علیه

---

(٥) [ بهترین راه غلبه بر نیگرانیها‌ر ] نگارش و اقتباس : محمد جعفر ص٢٠٦ •

(٦) سەر چاوەی پێشوو ص٢٠٨ • وە ( آرامش روانی و مذهب ) ص : ٢٠٤ •

(٧) ( آرامش روانی و مذهب ) ص١٦٧ ، دکتر : صفدر صانعی •

وسلم ڕایان دەدەیاند ، بۆ چی ؟! چونکە دەروونناسان بۆیان دەرکەوتوە کە پاڕانەوەو نوێژو هەبوونی بڕوایەکی پتەو بە ئایین ، خەمو پەژارەو ڕەین بڵاوی‌و ، هەڵچوون‌و ، ترس لە دڵو دەروونی مرۆڤدا نایەڵێت • ](٨)

دیسان دەڵێت : [ ئەمڕۆ پزیشکانی دەروونناس بوونە کادیرو ڕاگەیەنەری ئایین ، بەڵام نەك لەو لایەنەوە کە ئێمە لە دۆزەخ بترسێنن ، بەڵکو بۆ ئەوەی ئێمە لە دۆزەخی بریتی گەدە ( قرحة المعدة )و تێکچوونی مێشکی‌و شێتی‌و •• هد ڕزگار کەن ، ئێمە ڕادەسپێرن بە شوێن کەوتنی ئایین‌و خواناسی • ](٩)

**چوارەم : بول ارنست ادولف :**

مامۆستای یاریدەر لە توێکاری‌دا لە زانکۆی ( سانت جۆنس ) دەڵێت : [ ئایا هۆیە بنەڕەتی‌یەکانی نەخۆشی‌یە مێشکی‌یەکان چین ؟! لە هۆیە سەرەکی‌یەکانی ئەو جۆرە نەخۆشی‌یانە ، هەست کردن بە تاوان‌و ڕق‌و قین‌و ترسان‌و کپ کران‌و ڕاڕایی‌و دوو دڵی‌و دڵ پیسی‌و دڵتەنگی‌یە، جا ئەوەی جێی داخە ئەوەیە کە زۆر لەوانەی لە بواری چارە سەری دەروونی ( العلاج النفسی )دا کار دەکەن ، زۆر جاران لە گەڕان‌و سووڕان‌و پشکنینی دۆزینەوەی هۆیەکانی ئەو شێوانە دەروونی‌یەی دەبێتە هۆی نەخۆشی سەر کەوتوو دەبن ، بەڵام لە بابەت چارە کردنی ئەو شێوان‌و تێکچوونەوە بێ ئاکام دەبن ، چونکە ، بۆ چارە سەر کردنی

---

(٨) ( بهترین‌راه ژلبه برنیگرا نیها ) ص٢٠٧ ، ٢٠٨ •

(٩) هەمان بەرچاوە • ص٢٠٨ •

پەنا ئابەنە بەر بڵاو کردنەوەی بڕوا بەخوا بوون لە دەروونی ئەو دەردە دارانە دا •

وە ئێمە بێجگە لەوەش کاتێك سەبارەت بەو هەڵچوونو شێوانو تێکچوونە دەروونییانەو هۆیەکانیان دەپرسین ، دەبینین هەر ئەو شێوانو تێکچوونانەن کە ئاینەکان بۆ قونار کردنمان لە چەنگیان هاتوون ، چونکە خوای بەخشندە بە دەستەڵاتو کاربەجێیی خۆی داخوازییە دەروونییەکانمانی زانیوەو چارەسەری پڕ بە پێستی خۆشی بۆ دیاری کردوە • ](١٠)

دوایی دەڵێت :

[ من لە ماوەی کار کردنم لە بواری پزیشکیدا ، بۆم دەرکەوتوە کە چەکدار بوونم بە لایەنە گیانییەکان وێڕای شارەزاییم یاریدەم دەدات لە چارە سەر کردنی هەموو نەخۆشییەکاندا ، بە چارە کردنێکیوا کە پێتو فەڕی پێوە دیارە ، بەڵام ئەگەر بێتو مرۆڤ پەروەردگاری لەم مەیدانە فەرامۆش بکات ، ئەوە ڕەنجو هەوڵدانەکانی بەس نیوە چارەسەر دەبن ، بگرە هێندەش نابن •

زووربەی نەخۆشییەکانی گەدە پەیوەندی بەو شتەوە نیە کە خەڵك دەیخوات ، بەڵکو پەیوەندی بەو شتەوەیە کە دڵو دەروونیان دەخوات ، بۆیە پێویستە ئەو جۆرە نەخۆشە بەر لە هەر شتێك ڕقو قینو خەمو پەژارەکانی نێو دڵی چارە سەر بکرێن • با چاو لەو پێغەمبەرانە

(١٠) ( الله يتجلى في عصر العلم ) ط ٣ ص١٣٧ ، وه ( روح الدين الاسلامي ) ص١٧٥ ط ١٨ •

بکەین کە دوعایان بۆ ناحەزانیان دەکردو بۆیان دەپارانەوە ، چونکە هەر کاتێک دڵمان پاك بۆوەو ساف بووینەوە ، ڕێی چابوونەوە دەکرینە پێش ...

وە زۆر جۆرە حاڵەتی دەروویی هەن کە ترس‌و ڕاڕایی‌و دڵە ڕاوکە ڕۆڵێکی گرنگیان تێدا دەگێڕن ، جا ئەگەر بێت‌و ترس‌و دوو دڵی‌و دڵە ڕاوکە لە سەر بنچینەی پتەو کردنی بڕوا بەخوا بوونی مرۆڤ چارە سەر بکرێ ، ئەوە چاك بوونەوەو تەندروستی بە جۆرێکی‌وا دەگەڕێتەوە بۆ نیسان ، لە زۆر حاڵاندا وەك جادوو دەچێ • ]

ئنجا لە کۆتاییدا دەڵێت :

[ جەستەی مرۆڤ لە کاتێکدا لەگەڵ بەدیهێنەرو پەروەردگاری دا پەیوەندی‌یەکی ڕێک‌و پێکی هەبێ ، لە باشترین • حاڵدا دەبێ ، بەڵام بەبێ ئەوە ، ـ واتە بەبێ پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوادا ـ تێکچوون‌و دەردەداریمان تووش دەبێ • ](١١)

**پێنجەم : دکتور : هنری لنك :**

دەڵێت :

[ هەر لەو کاتەوە دەستم کرد بە پەی بردن بە گرنگی بیرو بڕوای ئایینی بۆ ژیانی مرۆڤ ، وە لەو ئەزموونانە ئەنجامێکی بایەخ دارم وەرگرت ، ئەویش ئەوەیە کە هەر کەسێك ، بڕوایەکی ئایینی هەبێ یان هاموو شۆی پەرستگایەك بکات ، کەسایەتی‌یەکی بەهێزترو چاکتری هەیە

---

(١١) [ الله يتجلى في عصر العلم ] ص١٣٨ ، نووسراوی : کۆمەڵێك لە زاناو پسپۆڕان •

ئـەو کەسەی هـیـچ ئایینێکی نیـە ، یان هیچ خـوا پەرستی یەك ئەنجام نادات . ](١٢)

شەشەم : دکتور : بریل :

دەڵێت :

[ بەڕاستی مرۆڤی خواناس قەت قەت تووشی نەخۆشی دەروونی نابێت . ](١٣)

حەوتەم : دکتور (و. س. الفاریز) :

دەڵێت :

[ ڕوون بۆتەوە کە چوار کەس لە هەر پێنج کەسی نەخۆش $\frac{4}{5}$ ، نەخۆشـی یەکـەیان ناگـەڕێتەوە بۆ بنـەڕەتێکی فسـیۆلۆجی ، بـەڵکو نەخۆشی یەکەیان لە ئەنجامی ، ترس و دڵەڕاوکەو ڕق هەستان و تـەماع و دیا پەرستی و .. هتدەوە پەیدابووە . ](١٤)

هەشتەم : دکتور الکسیس کاریل :

دەڵێت :

[ بیر کردنەوە بـە شێوەیەکی گشتی دەتوانێ چەندان نەخۆشی ئەندامی ( امراض عضویة ) بهێنێتە دی ، ئنجـا بێ ئارامی ژیانی هـاو چـەرخ و هەڵچوونی بەردەوام و ، نەبوونی ئاسوودەیی چەند حاڵەتێکی

---

(١٢) ( روح الصلاة ) ص٢٨ ط ١١ عن ( العودة الى الايمان ) هنري لنك .
(١٣) ( روح الدين الاسلامي ) عفيف عبدالفتاح طبارة ط ١٨ ص١٧٧ .
(١٤) ( جرد حياتك ) محمد الغزالي ص٣٦ .

دەروونی پەیدا دەکەن ، کە دەبنە هۆی تێکدانی مێشکی ، وەتێکدانی ئەندامی ، بۆ ئەدەو ڕیخۆڵەکان ، هەروەها خواردن پێ نەخوران و تێکەڵ بوونی مێکرۆبە ڕیخۆڵەیی یەکان لەگەڵ سووڕی خوێن ، وە سووتانەوەی گورچیلەو ئەوەی کە لێیەوە پەیدا دەبێت ، لە نەخۆشی یەکانی گورچیلەو میزڵدان ، ئەوانــە گشــتیان چــەند ئەنجــامێکی دووری نەبوونی ئارامیو هاوسەنگی ژیانیو ژیرین ، وە ئەم دەردانە لە نێو ئەو کۆمەڵگایانەدا کە بەژیانێکی ساکار دەژینو بۆو ئەندازەیەی کە باسمان کرد هەڵچوونی نیدانیەو دڵە ڕاوکەی تێدا بەردەوام نیە ، زۆر بە کەمی ناسراون •

دیسان ئەو کەسانەی کە دەتوانن ئارامی دەروونی یان بپارێزن لە بو جەنجاڵی شارستانەتی نوێدا • لە ئاقار شێوانو تێکچوونە مێشکیو جەستەیی یەکاندا پارێزراون • ] (١٥)

**نۆیەم : غاندی :**

پێشەوای گەورەی هیند گوتوویەتی :

[ ئەگەر بــە هــۆی نوێژو پاڕانەوەوە نەبوایە لــە مێژبوو شێت بووبووم ] (١٦) •

خوێنەری خۆشەویستم :

ئەوە بوو ڕای زانایانی دەروونناس سەبارەت بە گرنگی یادی خواو پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خوادا ، بۆ پاراستنی مرۆڤ لە دەردو نەخۆشی یە

---

(١٥) ( الانسان ذلك المجهول ) الكسيس كاريل الحائز على جائزة نوبل ص١١٧ •

(١٦) ( بهترين راه غلبه برنيگرانيها ) ص٢١٢ •

دەروونی‌یەکان ، ئەو دەردانەی کە سەر چاوەی هەڵقوڵینی زۆربەی زۆری دەردو نەخۆشی‌یە جەستەیی‌یەکانیشن وەک :

١ ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی سووڕی خوێن .

٢ ـ بەرز بوونەوەی پەستان ( صخط )ی خوێن .

٣ ـ سەر ئێشە ( ژانە سەر )ی نیمچەیی ( الصداع النصفی ) .

٤ ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی هەرس ( اضطراب جهاز الهضم ) .

٥ ـ قەڵەوی .

٦ ـ خواردن پێ نەخوران .

٧ ـ نەخۆشی برینداری گەدە ( قرحة المعدة ) .

٨ ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی هەناسە دان .

٩ ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی ئێسکی‌و ماسولکەیی ، ڕۆماتیزمی جومگەکان ئازاری پشت ، ماسولکە گرژبوون ( تشنج العضلات ) .

١٠ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی دەمار .

١١ـ تێکچوونی کۆ ئەندامی راووژێ ومیز .

١٢ـ نەخۆشی‌یەکانی پێست .

١٣ـ نەخۆشی شێر پەنجە ( سرطان ) .

١٤ـ نەخۆشی ڕیخۆڵەی گەورە .

١٥ـ تێکچوونی لوو ( ڕژێن )ەکانی ناوەوەی لەش(١٧) .

---

(١٧) (النفس : انفعالاتها ، امراضها ، علاجها ) د. علي كمال ص٣٦٩ . وە ( آرامش‌روانی‌و مذهب ) ص١٠٣ ، ١٠٤ . وە ( اصول علم النفس ) احمد عزت راجح ص ١٦٩ ، ١٧٠ .

کەواتــە :

خوێنەری ئازیز ، ئەگەر دەتەوێ لە دەردە دەروونی یەکان پارێزراو بی‌و ، لە زووربەی زۆری نەخۆشی یە جەستەیی یەکان چەپاڵەدراو بی‌و ، پەروەردگاری بێ هاوەڵ لێت ڕازی بێ ، ڕووبکــە خوداو هــەوڵ بدە هەمیشە لە یادت بێ‌و نەیەڵی پەیوەندی نێوانتان سست‌و خاو بێت ٠

ئێستاس کۆتایی ئەم باسە بە پەند قسەیەکی زۆر گرنگی ئەلکسیس کاریل دێنین :

[ ئێمە کاتێك چالاکی یەکانی خۆمان بەرەو یەك ئامانج‌و مەبەستی دیاری کراو ئاراستە دەکەین ، ئـەوە ئەرکە گیانی‌و جەستەیی یەکانمان زۆر ڕێك‌و پێك دەبن ، چونکە یەکخستنی ئارەزووەکانی لەش‌و ئاواتەکانی گیان بەرەو یەك ئامانج ، ئاشتی‌و ئارامی یەکی دەروونی پێك دێنێ ٠٠٠

ئنجا لەگەڵ ئەوەش‌دا ـ واتە لەگەڵ خۆ یەکلا کردنەوەش‌دا بۆ مەبەستێکی دیاری کراو ـ نابێ بەس بە تێوەڕامانی جوانی دەریاو شاخ‌و هەورو تابلۆ دڵگیرەکانی هونەرمەندو شاعیران‌و ، قسەو پەندە بەرزەکانی زاناو فەیلەسووفەکان‌و ئەو کارە بیرکاری یانەی کسە وردەکاری یاسا سروشتی یەکان دەخەنە ڕوو ، واز بێنێ ، بــەڵکو پێویستــە گیانێکی وا وەدەست بێنێ کــە هــەوڵی گــەیشتن بە نموونەیەکی ڕەوشتی ی بــەرز دەدات ، وە لە تاریکی یەکانی ئەم جیهانەدا لە ڕووناکی دەگەڕێ ، وە هەرچی زووتر بەرەو ئاین دەڕوات وە نەفسی خۆی دەخاتە ئەولا ، بۆ ئەوەی لە بنچینە نەبینراوەکەی ئەم جیهانە ـ بەر هەستە ـ تێ بگات ـ

واته : خوای بەخشندەو بێ وێنە باسێ ـ • ][18]

بەڵێ ، بەڕاستی مرۆڤ بەس بە خۆ یەکلا کردنەوەو خۆ تەنیا کردن و ڕوو کردنە یەک ئامانج و سەر گەرم بوون بە هێنانەدی یەک ئاواتەوە کە بریتیە لە ڕەزامەندی خوا ، ئارامیی و ئاسوودەیی و دڵنیایی دەروونی تێدا دێتە دی ، هەر بۆیەش مامۆستای دەروونناسی لە جیهاندا فەرموویەتی :

[ من جعل الهموم هما واحدا : هم المعاد ، كفاه الله هم دنياه ، ومن تشعب به الهموم في احوال الدنيا ، لم يبال الله في أي أودية هلك • ] رواه الحاكم وابن ماجه ـ جدد حياتك : محمد الغزالى ص٣٦ ، وتأريخ التصوف الاسلامي : عبدالرحمن بدوي ط٢ ص١١٣ •

واتە :

هەر کەسێك مەبەستەکانی بکاتە یەک مەبەست : مەبەستی دواڕۆژ ـ یانی گەیشتن بە ڕەزامەندی خواو بە هەشتی بەرین ـ خوای بەرز مەبەستەکانی ژیانی دنیای بۆ دێنێتە دی ، وە هەر کەسێك بە هۆی هێنانە دی ئارەزووەکانی ژیانی دنیاوە مەبەستەکانی لێ بڵاو بن ، خوا گوێی نادات لەچ دۆڵ و شوێنێکدا لە نێو دەچێ •

جا هەڵبەتە : یادی خواش کاریگەرترین هۆی یاریدەدەری مرۆڤە بۆ خۆ یەکلا کردنەوەو خۆ تەنیا کردنی بۆ خوا •

تێبینی : بەشی دەیەم بۆ توێژینەوەی ئەم باسە تەرخان کراوە •

---

(١٨) ( الانسان ذلك المجهول ) ص١١٨ •

# بەشی حەوتەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو پێکەوە جۆش دانی مسوڵمانان

یادی خوا هۆیەکی یەکجار کاریگەرە بۆ پێکەوە جۆش دانی مسوڵمانانو بەهێزکردنی پەیوەندی برایەتی نێوانیان ، چونکە یادی خوا دەگونجێ بەتەنێ بکرێ ، وە لەهەندێك حاڵاندا دەگونجێ بەکۆمەڵیش بکرێ •

جا ئەگەر بێتو یادی خوا بەکۆمەڵ بەڕێوە ببرێ ، ئەوە کاریگەرترین هۆی لێك وەنیزیك خستنی بڕوادارانە •

خوای زاناو قسەلەجێ لەو بارەوە بەپێغەمبەری صلى الله عليه وسلم فەرموە : [ واصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة والعشي ، يريدون وجهه ولا تعد عيناك عنهم تريد زينة الحياة ، ولا تطع من اغفلنا قلبه عن ذكرنا واتبع هواه وكان أمره فرطاً • ] الكهف ـ ٢٨ •

واتــە :

ـ ئەی پێغەمبەر ـ ئارام بگرەو خۆت ڕاگرە لەگەڵ ئەوانەی کە بەیانیانو ئێواران لەخوا دەپاڕێنە ـ دوعاو پاڕانەوە چاکترین جۆری یادی خوایە ـ ڕەزامەندی خوایان دەوێ ، وەچاویان لەسەر هەڵمەنگێوەو ئاگات لێیان نەبڕێ بەهۆی ویستنی ڕازاوەیی ژیانی دنیا ، وە گوێ ڕایەڵی

ئەو کەسە مەبە کە دڵیمان لەیادی خۆمان بێ ئاگا کردووەو کەوتۆتە دوای ئارەزووی‌و زیاد لەپێویست تێنووساوەو زیادەڕۆیە •

وەک دەبینین پەروەردگاری بەخشندە فەرمان بەپێغەمبەری ڕەوشت بەرز دەکات کە لەکۆڕی یادکەران ( مجلس الذاکرين )دا دانیشێ‌و ئاگای لێیان نەبڕێ •

پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم سەبارەت بە خوا یادکردنی بەکۆمەڵ فەرموویەتی : [ ليبعثن الله أقواما يوم القيامة في وجوههم النور على منابر اللؤلؤ ، يغبطهم الناس ، ليسوا بأنبياء ولا شهداء ، قال فجثا أعرابي على ركبتيه فقال : يا رسول الله صفهم لنا نعرفهم ، قال : المتحابون في الله من قبائل شتى وبلاد شتى يجتمعون على ذكر الله يذكرونه • ]
اخرجه الطبراني في الكبير بأسناد حسن / تربيتنا الروحية : سعيد حوى •

واتە :

ڕۆژی قیامەتێ خوا چەند کۆمەڵێک زیندوو دەکاتەوە ، ڕوویان ڕووناکی پێوەیە ، لەسەر چەند دوانگەیەکی لەگەوهەر دروست کراون ، خەڵکی ئیرەیی ـ حەسوودی ـ بان پێ دەبەن ، نە لە پێغەمبەرانن‌و نە ئەشەهیدانن ، ـ ڕاوی گوتی ـ عارەبێکی دەشتەکی لەسەر چۆکان دانیشت‌و گوتی : ئەوانەن کە لەپێناوی خوادا یەکدی‌یان خۆش دەوێ ، لەچەند تیرەیەکی جوێ جوێ‌و چەند نیشتمانێکی لێک دوورەوە دێن ، بەبۆنەی یادی خواوە کۆدەبنەوەو یادی دەکەن •

دوو پێشەوا بەرزەکەی فەرموودە ناس ( المحدث )یش ـ یانی ئیمامی بوخاری‌و ئیمامی موسلیم ـ فەرموودەیەکی بەلەزەت سەبارەت

بەکۆڕو کۆمەڵی یادی خوا دەگێڕنەوە ، بەڵام لەبەر درێژی یەکسەر مانا کوردی‌یەکەی دەنووسین :

[ ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : خوا چەند فریشتەیەکی هەن بەڕێو بانانداد دەگەڕێن بەدوای ئەوانەدا وێڵن کەیادی خوا دەکەن ، جا هەرکە کۆمەڵێکیان دیتەوە کەیادی خوا دەکەن ، بانگی یەکتر دەکەن ، وەرن بۆ شتەی لێی دەگەڕان ، ئنجا دەسبەجێ بەهۆی باڵە کانیانەوە دەنێو خۆیان دەگرن بە بەرزی نێوان زەوی‌و ئاسمانی یەکەم ، ئنجا پەروەردگاریان لێیان دەپرسێ ـ وە بۆخۆشی لەوان چاکتر دەزانێ ـ : ئەوە بەندەکانم چ دەڵێن ؟!

دەڵێن پاکیت دەردەبڕن‌و گەورەییت بۆ بڕیار دەدەن‌و سوپاست دەکەن‌و بە بەرزی باست دەکەن ، پێیان دەڵێن : جا بۆ دیتوویانم ؟!

دەڵێن : نەبەخوا نەیان دیوی .

دەڵێت : ئەگەر دیتبایانم چۆن دەبوون ؟!

دەڵێن : ئەگەر دیتبایانی زیاتر دەیان پەرستی‌و زیاتر بەرزی تۆیان دەردەبڕی‌و پتر بە پاکیان دەگرتی .

دەڵێت : جا ئەوە چیم لێ داوا دەکەن ؟!

دەڵێن : بەهەشتت لێ دەخوازن .

دەڵێت : جا بۆ دیویانە ؟!

دەڵێن : نە بەخوا ئەی پەروەردگار نەیان دیوە .

دەڵێت : جا ئەگەر دیبایان چۆن دەبوون ؟!

دەڵێن : ئەگەر دیبایان لەسەری سوورتر دەبوونو زیاتر داوایان دەکردو ئارەزوویان بۆ وی گەورەتر دەبوو .

دەڵێت : ئەدی خۆ لەچی دەپارێزن ؟!

دەڵێن : لە ئاگر ـی دۆزەخ ـ .

دەڵێت : بۆ دیویانە ؟!

دەڵێن : نە بەخوا نەیان دیوە .

دەڵێت : جا ئەگەر دیبایان چۆن دەبوون ؟!

دەڵێن : ئەگەر دیبایان توندتر لەبەری هەڵدەهاتن ، وە زیاتر لێی دەترسان .

دەڵێت : دەئەوە ئێوەم کردە شایەد ، کەمن لێیان خۆش بووم ، یەکێك لە فریشتەکان دەڵێت : فلانکەس لەنێو وان دایە ، بەڵام لەوان نیە ، بەڵکو ئیشی هەبووە بۆیە هاتوە .

دەڵێت : ئەوانــە کۆڕو کۆمەڵێکن هەرکەسێك لەگەڵیان دانیشێ ، بەدبەخت نابێ ـ بەڵکو سەرفرازو بەختیار دەبێ ـ . ](١)

هەڵبەتە فەرموودەی پێغەمبەر صلی اللہ علیه وسلم دەربارەی کۆڕ بەستنو کۆبوونەوە بەبۆنەی یادی خواوە زۆرنو لەباسی : « بەرزی پلەوپایەی یادی خوا »دا بڕێکیانمان خستوونە ڕوو ، بەڵام لەم باسەدا دەمانەوێ دەری خەین داخوا سوودو حیکمەتی کۆڕبەستنو کۆبوونەوە

---

(١) التاج ، ج٥ ص٨٦ ، ٨٧ .

لەکاتی یادکردنی خوادا چی‌یە !؟ ، واتە بابزانین بۆچی ئیسلام گرنگی بە کۆڕبەستن داوەو پێی لەسەر داگرتوە ؟!

ئیسلام لە سۆنگەی ئەوەوەکە بەرنامەی سەرتاسەری[٢] ژیانە بۆ تیکڕای مرۆڤایەتی ، قەت قەت تاقە زەلام ناتوانێ بە تەنیا ـ وەک پێویست ـ بەڕێوەی بەرێ ، بەڵێ بەڕاستی ئیسلام کۆڵێکی قورسەو مرۆڤ ناتوانێ بە تەنیا هەڵی گرێو پێویستی بەگەڵو کۆمەڵێکی دڵسۆزو گیانفیداو لێبڕاو دەکات •

بەڵێ سروشتی ئیسلام وا داخوازی دەکات کە شوێن کەوتووانی بۆ بەڕێوە بردنو جێبەجێ کردنی هەموو کارو فەرمانەکانی ڕیزێ ببەستنو پێکەوە جۆش دراو خڕو جربن[٣] •

بێگومان کۆبوونەوەی کۆمەڵە مرۆڤێکی خواناسو بڕواداریش بە مەبەستی یادکردنی خوا دەبێتە هۆی پێکەوە جۆشدانیانو لەلای یەک خۆشەویست تر کردنیان ، چونکە ئەوان بەیەک دڵو گیانەوە ، بۆ یەک ئامانجو مەبەست ، لەخزمەت یەک خوادا دادەنیشن ، کەواتە : هەموویان ڕێبواری یەک ڕێگەنو عەودالی یەک ئامانجو بەندەی یەک پەروەردگارن •

هەڵبەتە کۆمەڵێکیش کە پێکەوە ملی ڕێیەک دەگرن هەر کامێکیان بەدڵو گیان هاوڕێیەکانی خۆش دەوێو حەز بە ساغو سەلامەتی‌و

---

(٢) لەو ڕاستی‌یەمان لە کتێبی [ پوختەیەک •• ]دا چاک ڕوون کردۆتەوە بڕوانە لاپەڕە : ٢٠٤ ، گەوهەری حەوتەم •

(٣) ئەم باسەش لەسەر چارەی ڕابردوودوا لە هەمان گەوهەردا توێژراوەتەوە •

سەرکەوتنیان دەکات ، چونکە ساغ و سەلامەتیو سەرکەوتنی هەر یەکێکیان بە ساغو سەلامەتیو سەرکەوتنی ئەوانی دیکەوە بەستراوە ، ئەو خوا ناسانەش کەبیکەوە زوو دەکەنە خواو یادی دەکەن بەهەمان شێوە ، کەواتە هەر کاتێك دوو مسولمان یەکدی بپوغزێنن ، ئەو یەکتر بوغزاندنەیان بەنگەیەکی درەوشاوەیە لەسەر ئەوە کە شتاقیان بۆ خوا ساغ نەبووتەوەو خۆیان یەکلا نەکردۆتەوە ، دەنا خۆ هیچیان بەشی هیچیان ناخۆن بۆ دەبێ یەکتریان خۆش نەوێ ؟!

جا خوێنەرانی بەڕێزو سەنگین لێرەدا بە پێویستی دەزانم برێك مۆڵەتتان لێ وەربگرمو بەرەو لاباسێکی یەکجار گرنگتان بەرمو دوای تەواو کردنی بگەڕێینەوە سەر تەواو کردنی ئەم باسە ، هەرچەند ئەو لاباسەش پەیوەندییەکی پتەوو بەتینی لەگەڵ ئەم باسەی ئێستامان دا هەیە ، بەڵام من لەبەر زێدە بایەخو گرنگییەك کە هەیەتی وام بەچاك زانی بە جیا بینووسم :

## لاباسێکی زۆر گرنگ

### هۆی دابڕ دابڕ بوونی مسولمانانو ڕێی چارەسەر کردنی

پرسنی یەکەو لە گوتنی ناسڵەممەوە :

ئەمڕۆ کە ئێمەی مسوڵمان لە قۆناغێکی یەکجار دژوارو هەلو مەرجێکی زۆر ناسكدا دەژین ، هەندێکمان کە خۆیان لە مسوڵمانە سادەو عەوامەکانیش بە پشتەوەتر دەزانن و بە حیساب خولیاو کەڵکەڵەی هێنانەوە کایەی ئیسلامو گێڕانەوەی حوکمی خوایان لە کەللەدا هەیە ، بەهۆی : خۆ کورت هەڵێنانیان لە جوغزی چەند کتێبێکی ئیسلامی داو ،

چاو چڕ داگرتنیان لە سەر چەند دەقێك‌و زیادە ڕۆیی کردنیان لە هەندێك لایەن داو ، بە وشکی تەفسیر کردنی هەندێك ئایەت‌و فەرموودەو ، گومانی بەد بە خەڵکی بردن‌و ، توندو تیژی نواندنێکی بێ‌جێ لە جێ‌بەجێ کردنی کاروباری ئاین:[(٤)] ، جۆرە ئیسلامێکی تایبەتی‌و سەر

---

(٤) کەواتە سەرجەمی ئەو هۆیە سەرەکی یانەی دەبنە پەیداکەری دیاردەی [ دابڕ دابڕ بوونی مسولمانان ] ئەمانەن :

١ ــ خۆ کورت هەڵێنان لە جوغزی کتێبی چەند کەسێکی دیاری کراودا ، هەر وەکو بێجگە لەو نووسەرانە کە ئەو کەسانە خۆیان بە نووسراوەکانیانەوە شەتەك داوە کەسی دیکە لە ئیسلام حاڵی نە بووبێ !!

٢ ــ چاو چڕ داگرتن لەسەر چەند دەقێك‌و زیادە ڕۆیی کردن لە هەندێك لایەن‌دا ، وەك ئەوانەی کە دێنن ئەو دەقانەی دەربارەی جیهادی نەفس‌و پاك کردنەوەی دەروون‌و گەشە پێدانی لایەنی گیانی جوێ دەکەنەوە‌و جۆرە ئیسلامێکی مەعنەوی‌و قیامەتی‌و سۆفیانەی ڕووتیان لێ ڕێك دەخەن‌و . لە چوار چێوەیەکی تەسك‌و کەمبەردا خۆیان ڕێك دێنن‌و دەکەونە جیهانێکی خەیاڵی دوور لە واقیعەوە .

٣ ــ بەوشکی گرتن‌و تەفسیر کردنی هەندێك ئایەت‌و فەرموودە ، وەك ئەوانەی کە بەبێ لەبەر چاو گرتنی واقیعی خەڵك‌و ئەو قۆناغ‌و هەل‌و مەرجەی ئیسلامی پێدا ڕادەبرێ ، گرنە لە هەندێك دەقی ئیسلامی دا دەگرن ــ کە ڕەنگە لەم هەل‌و مەرجەدا هەر پێویست نەکات بخرێنە ڕوو و خەڵکیان پێوە سەرقاڵ بکرێ ــ و ، پێیان وایە ئیسلام هەمووی جێ بەجێ کراوەو لە دڵی خەڵکی‌و واقیعی ژیان دا چەسپاوە‌و یەکی لەسەر ئەو چەند شتە وردیل ( جزئی ) انە گەودوە !! بەڵام : لە بێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات ! .

٤ ــ گومانی بەد ( سوء الظن ) بە خەڵکی بردن ، وەك ئەوانەی کە

بەخۆیان دروست کردوەو خۆیان لە مسولمانان دابڕیوەو گۆشەگیر بووون ، هەلبەتە ئەو خۆ هەلاواردن و خۆ دابڕین و گۆشەگیر بوونە ،

---

بە شێوەیەکی سادەو دلڕەقانە حوکمی : فاسق بوون و کافر بوون و وەرگەڕان بەسەر خەلکی دا دەدەن ، بێ ئەوەی واقیعی ژیانی ئەو کەسانەو ، مەسەلەی لە ئیسلام حالی بوون و حالی نەبوونیان لەبەر چاو بکرن ، ئیبن و بەطوطەیی یانە سیاسەتی [ عمرها الله ودمرهـا الله ](١) یان کرتۆتە پێش و کەس لە نشتەری تیژی زمانی حوکم دەرو فتوا دەرکەریان قوتار نابێ و ، دنیایان لە ئوممەتی ( محمـد ) کردۆتە چەرمی چۆلەکەو ، مەگەر چۆن دەنا ڕەنگە هەنگاوێکیش نەنێن لە بڕینی ڕێی کۆڕین و نال و گۆڕکردنی ئەو واقیعەی کە خەلکی ناچار دەکات بە کردنی زۆر شتی نەگونجاوو بێ شەرعی !! ( چاک ورد بەوە ) ٠

٥ ـ توندو تیژی نواندنێکی بێ جێ لە جێ بەجێ کردنی ئەرک و فەرمانەکانی ئاین دا ، وەك ئەوانەی کە هەمیشە بەدوای ئەرک و فەرمانە گرانەکان ( العزائم ) دا دەگەڕێن و بەلای ئاسانەکان ( الرخص ) دا ناچن ، بێ ئاگا لەوەی کە ڕەچاو کردنی سووکی و ئاسانی یەکێکە لە بنەڕەتە ڕەسەنەکانی بەرنامەی خوا ، هەلبەتە بەم شێوازەش ئیسلام لەبەر چاوی خەلکی دەبێتە شتێکی گران و ئەستەم و ناسروشتی و لێی دەڕەونەوە ٠

---

(١) دەگێڕنەوە ( ابن بطـوطە )ی گەڕیدە ( سیاح ) لە گەڕان و گەشتەکانی دا بەکێ هەر ئاوەدانی یەک دا ڕەت بووبا دەیپرسی داخوا ئەم ئاوەدانی یە مسولمان نشینە یان نا ؟ جا ئەگەر مسولمان نشین با دەیگوت ( خوا ئاوەدانی بکات ) ، ئەگەر نا دەیگوت : خوا کاولی بکات ، بێجگە لەم دوو ڕستەیەش چ دووعای دیکەی پێ نەبوون !

هیچ کاتێکو بەتایبەتی لەم بارو دۆخە ناسکەی ئێستامان دا بە قازانجی ئیسلامو مسوڵمانان تەواو نابێ ، بگرە زیانیشی هەیەو ئیمپریالیزمی جیهانیی‌و دوژمنو ناحەزانی نێوخۆمان ، وەک دڕندەیەکی لە دەرفەت خەفتاو ، کاتێک چاوی بە ئاوا واقیعێك دەکەوێ وەک نێچیرێکی بەتامو لەزەت دەی قۆزێتەوە •

جا بە بڕوای من ئەم خۆ هەڵاواردنو خۆ جیا کردنەوەیە لەڕیزەوی گشتی مسوڵمانان ، یان هەر جۆرە یەکتر بوغزاندنو لەیەکتر خوێندنو دووبەرەکی نانەوەیەک گەورەترین زیان لەئیسلامو مسوڵمانان دەدات •

وە ئەوەندەی لەم دیاردەیە وردبوومەوەو سەرنجم داوەتێ لە دوو هۆی بنەڕەتی بترم بە بیردا نەهاتوە بۆ پەیدا بوونی‌و گەشە کردنی :

یەکەم :

بێ ئاگایی‌و نەشارەزایی سەبارەت بە سروشتی ئیسلام ، کە هەردەم بابای مسوڵمان هەڵدەنێ بۆ یەك ڕیزی‌و برایەتی‌و تەبایی ، وە بێ ئاگایی بە ناسکی‌و دژواری ئەم هەلو مەرجەی ئێستامان کە دوژمنانی نێو خۆو دەرەوە ، وەک دڕندەیەکی برسی‌و بێ ویژدان خۆیان لێ مات کردوینو چاوەڕێی دەرفەتێکی وان •

دووەم :

خۆیەکلا نەکردنەوە بۆ خوا ، واتە نەبوونی ( اخلاص ) بەس خوا مەبەست بوون •

ئێستا کە زانیمان هۆی پەیدا بوونی ئەم دیاردەیە چی‌یە ، با بزانین ڕێی چارەسەر کردنی چی‌یەو چۆنە ؟!

یەکەم : شارەزا بوون بەسروشتی ئیسلام :

بێگومان شارەزا بوون بەسروشتی ئیسلام چەمکێکی بەرفراوانی هەیەو زۆر شت دەگەیەنێ ، بەڵام ئێمە لێرەدا چەند شتێکمان مەبەستە :

١ – ئیسلام بەرنامەیەکی هەمەلایەنەی ژیانە ، واتە بەرنامەیەکە بۆ هەموو لایەنەکانی ژیان : مەعنەوی ، سیاسی ، کۆمەلایەتی ، ڕۆشنبیری ، پەروەردە ، سوپایی .. هتد .

کەوابێ کورت هەڵێنانو گچکە کردنەوەی ئیسلام لەیەکێك لەم لایەنانەدا شتێکی هەڵەیە .

٢ – ئیسلام بەرنامەیەکە بۆ بەڕێوەبردنو سەربەرشتی کردنی ژیانی مرۆڤایەتی هاتوە ، لە هەموو چاخو ڕۆژ گارێك دا ، کەواتە : نابێ بەناوی ئیسلامەوە ڕێ لەهیچ جەشنە داهێنانو گۆڕانو گەشەکردنێکی ئەرێتی ( ایجابی )و سوود بەخش بگرینو ، نابێ بەناوی ئیسلامەوە بەر هەڵستی هیچ جۆرە زانیارییەکی (٥) بەکەڵكو ڕاستەقینە بکەین بە بەهانەی ئەوەی گوایە لەگەڵ ئیسلامدا ناگونجێن ، چونکە هیچ کاتێك زانیاری ڕاستو ئایینی ڕاست دژ ناوەستنو تێك ناگیرێن .

٣ – ئیسلام هەروەك چۆن لەسەرەتاوە پلە پلە گەشەی کردو وردە وردە فرازوو بوو ، ئێستاشو دوای ئێستاش کە بویستری

---

(٥) کەواتە : ئێمە کە لە نووسینەکانماندا دژی بیردۆزە مرۆڤکردەکان دەدوێین بۆیەیە چونکە بە بەرهەمێکی زانیاری یانەو ڕاستو بەکەڵکیان نازانین .

لەکۆمەڵگایەکی لەئیسلام وەدوور کەوتووی وەک کۆمەڵگای ئێمەدا بکرێتەوە بەرنامەی سەرلەبەری ژیانی گەلو لەواقیعدا بچەسپێنرێتەوە ، پێویستە پلە پلەیی ( التدرج )و لەگرنگترەوە بۆ گرنگ چوون ڕەچاو بکرێ •

کەواتە : خۆ خەریک کردن بەشتە وردیلە ( جزئی ) کانەوە پێش چەسپاندنی بنچینە سەرەکییەکانی ئیسلام ، هەم شتێکی نائیسلامانەیەو هەم بێ بەرهەمو نەگونجاویشە •

٤ ـ ئیسلام بۆ خێرو خۆشیو بەرژەوەندی بەندەکان ڕەوانە کراوە وەک خوای بەرز فەرموویەتی : [ وما ارسلناك الا رحمة للعالمين ] ، بەڵێ مەبەست لە نێرانی ئیسلامو ڕەوانەکرانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم هێنانەدی سوودو بەررەوەندیو خۆشگوزەرانی خەڵکییە ، لەڕێیەکی ڕاستو شەرعییەوە ، مادام وابێ ، خستنە بەرچاوی ئیسلام وەک شتێکی داسەپێنراوی بێ حیکمەتو ، بێگارێکی خەڵک ئازاردەرو ، ڕێ بەبیر کردنەوەو پرسیار نەدەر ، دژی سروشتی ئیسلامەو بەرنامەی خوای پێ ناشیرین دەکرێ ، کەواتە : با هەموومان ئەم قسەیە : [ أينما وجدت المصلحة فثم شرع الله ] •

( هەر جێیەك خێرو بەررەوەندی ـ خەڵکی ـ لێبێ شەرعی خودا لەوێیە ) وەك یاسایەك لەبەرچاو بگرین[٦] •

---

(٦) هەڵبەتە لێرەدا مەبەست نە لە هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکەو نەلە هەموو جۆرە خەڵکێك ، بەڵکو مەبەست بەرژەوەندییەکی بەکەڵكو سوود بەخشە بۆ خەڵکێکی بەڕاستی مسوڵمان ، بۆ چاکتر حاڵی بوون لەم مەسەلەیە واباشە سەرنجی ( ضوابط المصلحة في الشريعة

٥ ـ ییسلام بەشێوەیەکی گشتی لە هەموو یاساکانیدا ئاسانی ( السهولة والیسر ) ڕەچاو کردوە ، وەک خوای بێ هاوتا بۆ خۆشی فەرموویەتی : [ یرید الله بکم الیسر ولا یرید بکم العسر ] البقرة ـ ١٨٦ •

واتە : خوا دەیەوێ شتتان لەسەر ئاسان بکاتو نایەوێ لەسەرتان گران بکاو سەغلەتتان بکات •

پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : [ بشروا ولا تنفروا ویسروا ولا تعسروا ] رواه الشیخان عن ابی موسی / تاج الاصول ج٤ ص٣٦٧ •

واتە : موژدە دەرو دڵخۆشکەر بنو ترسێنەرو ڕەوێنەرەوە مەبن ، وە ئاسانکەر بنو وە زەحمەت خەر مەبن •

دیسان ( عائشة ) خوا لێی ڕازی بێ دەڵێت : ( ما خیر رسول الله صلی الله علیه وسلم بین امرین الا اختار ایسرهما ما لم یکن اثما ) رواه مسلم •

واتە : پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەر کاتێك ئازاد کرابێ لە هەڵبژاردنی شتێك لە نێوان دووان دا هەر ئاسانتری هەڵدەبژارد بەمەرجێك تاوان نەبووبێ •

کەواتە : گران کردنو وەزەحمەت خستنی کاروباری ئیسلامی لەسەر خەڵکی ، بەتایبەتی خەڵکێکی تازە بەرەو ئیسلام هاتوو ، شتێکی نەگونجاوە لەگەڵ سروشتو بەرژەوەندی ئیسلامدا •

---

الاسلامیة ) بدرێ ، نووسینی : دکتۆر : محمد سعید رمضان البوطی •

٦ ـ ئیسلام ئاینێکی یەکجار فراوانەو تەنیا بریتی نیە لەقسەی چەند زانایەکو نوسراوی چەند نووسەرێک ، کەوابێ چاو چڕداکرتنو دەمارگیری ( تعصب ) سەبارەت بە بیرو بۆچوونی چەند زانایەکو خۆ بەستنەوە بە چەند کتێبو نوسراوێکی دیاری کراوەوە ، سەرەڕای ئەوەی کە شتێکی هەڵەیە ، دەبێتە هۆی کچکە کردنەوەی ئیسلامو کۆمەڵ کۆمەڵ بوونی مسوڵمانان •

کەواتە : با بەچاوێکی فراوانو هەمەلایەنەو بەوێژدانەوە سەیری ئیسلام بکەینو ، با هەروەك چۆن ڕێ بەخۆمان دەدەین کە ئازادو سەربەست بین لە هەڵبژاردنی هەڵوێستو ڕای تایبەتیدا با هەمان ماف ـ مافی هەڵبژاردن ـ بەخەڵکی دیکەش ڕەوا ببینینو ڕاو بۆچوونی خۆمان بەسەر کەسدا نەسەپێنین •

دووەم : ئاگادار بوونو شارەزا بوون بەو بارو دۆخەی تێیدا دەژینو بەو هەلو مەرجەی گەلەکەمانی پێدا ڕادەبرێ :

بەڵێ شارەزاییمان بەو بارو دۆخە تایبەتی‌یەی گەلەکمانی تێدا دەژی • شتێکی حەتمیو پێویستە کە بمانەوێ ڕێگا لە پارچە پارچە بوونو لێك دابڕانی گەلی کوردی مسوڵمانمان بگرین • چونکە گەلەکەمان بە هۆی ستەمدیدەیی‌و بێ سەرەو بەرەیی‌یەک کە تێی کەوتوە ، بارو دۆخێکی دەروونی تایبەتی تێدا هاتۆتە کایەو پێویستە لەکاتی باسکردنو خستنەڕووی ئیسلامدا ئەو هەلو مەرجو بارو دۆخە دەروونی‌یە تایبەتی‌یە لەبەر چاو بگیرێ •

هەڵبەتە ئەم قسەیەی ئێستا کردم ڕوون کردنەوەو توێژینەوەی زۆر هەڵدەگرێ ، بەڵام لەبەر بۆنەلوان ـ بۆنەلوانیش جۆرە زۆرن ! ـ بە

بەری‌یەوە بانیشمو هەر هێندە دەڵێم : کە پێویستە لەدەمی خستنە ڕووی ئیسلامدا بۆ گەلێکی وەك کورد زۆر پێکیری لەسەر ئەوە بکرێ ، کەئیسلام وەڵامدۆی هەموو پرسیارێکەو شیفاهێن‌و ساڕێژکەری هەموو دەردو زامێکە ئەگەر ئەو دەردو زامەش بریتی بێ : لەستەمدیدەیی‌و بێ قەوارەییش !

سێیەم : ئاگاداری لە پیلان‌و فێڵ‌و تەڵەکەی ئیمپریالیزمی جیهانخۆرو ناحەزانی ناوخۆو خۆماڵی :

بەڵێ ، بۆئەوەی پتر هەست بەگرنگی برایەتی و تەبایی و یەك ڕیزی بکەین ، پێویستە وریاو بێدار بین‌و لە پیلان‌و فێڵی دوژمن‌و ناحەزی دەرەکی‌و نێوەکی ( الخارجي والداخلي ) ئاگادار بین •

چونکە ئیمپریالیزمی جیهانی‌و کاسە لێسە خۆماڵی‌یە کانیشی ، هەوڵی ڕۆژو شەویان بەڕێوە بردنی نەخشەو پیلانی کلاویانە بەپێی دەستووری زۆر باوو دێرینیان ( فرق تسد ) بەرتکەو زاڵبە !

جا پێویستە ئێمەی مسوڵمانیش هەوڵی ڕۆژو شەومان بەڕێوە بردنی نەخشەو بەرنامەی پیرۆزی ئیسلامەی بێت ، بەپێی یاسای بەپێزی : [ انما المؤمنون اخوة ] بێگومان هەر برواداران بران • وە بەپێی یاسای : [ واعتصموا بحبل الله جميعا ولا تفرقوا ] تێکڕا دەست بە ئاینی خواوە بگرن‌و پەرتەوازەو دابڕ دابڕ مەبن •

چوارەم : خۆ یەکلا کردنەوە بۆ خوا :

بەڵێ ، بەڕاستی هەر گەل‌و کۆمەڵێك ، بێجگە لە ئامانجی ڕازی کردنی خوا ـ بەهۆی بەڕێوەبردنی ئیسلامەوە ـ هەموو ئامانجێکی

دیکەو ، بێجگە لەبەرژەوەندی ئیسلام هەموو بەرژەوەندی‌یەکی دیکە ، وەلابنێ ، هەرگیز ئەم دیاردەی دابڕ دابڕ بوونەی تێدا پەیدا نابێ •

کەواتە : ئەگەر بۆ ئیسلام بە پەرۆشین‌و بۆ گەلی مسوسانمان دلسووتاوین ، با هەر کامێکمان هەوڵ دات زیاتر خەسڵەتی دڵسۆزی‌و بەس خوا مەبەست بوون ( الاخلاص ) لە خۆی دا بێنێتە دی •

پێنجەم : ڕەفتار کردن لەگەڵ یەکدا بە دادگەرانە :

بۆ هێنانەدی ئەم خەسڵەتەش لە خۆماندا پێویستە ، هەر کامێکمان بەگوێرەی یاسایەکی یەکجار گرنگی ئیسلامی کار بکەین کە موسوڵمانە پێشینە ڕەسەنەکانمانی لەسەر رێک کەوتوون ، بۆ کوشتنی میکرۆبی دەردی دابڕ دابڕ بوون‌و پەرتەوازەیی ، ئەو یاسایەش ئەمەیە :

[ نتعاون فيما اتفقنا فيه ، ويعذر بعضنا بعضاً فيما اختلفنا فيه ] •

واتە : [ هاوکاری یەکتر دەکەین لەو شتانەدا کە لەسەریان رێک کەوتوین وە چاو پۆشی لەیەکتر دەکەین‌و عوزر لە یەکدی وەر دەگرین لەو شتانەدا کە تیاندا جیاوازین • ]

ئنجا بێگومان لەهەموو بنچینەکانی ئیسلامدا یەکین‌و لە زوربەی وردە بابەتەکان ( الجزئيات )یش‌دا بە هەمان شێوە ، بەڵام لە هەندێك شتی لاوەکی « ثانوی »ی‌دا ڕامان جیاوازەو ئەوەش ڕێ لەبرایەتی‌و هاوکاری‌و تەبایمان ناگرێ •

خوێنەری بەڕێز :

ئەوە کورتەو پوختەیەکی زۆر کورت ، ئەمما بەپێز بوو سەبارەت

بە لا باسێکی یەکجار گرنگ ، هیوادارم زۆر بەوردیو ڕامانەوە چەند جارێك بیخوێنیەوە .

ئێستاش با بگەڕێینەوە سەر باسەکەی گۆرین :

بەڵێ ، لەڕاستیدا کۆڕ بەستنی کۆمەڵە بڕوادارێك لەکاتی یادی خوادا ، یان بەڕیز ڕاوەستایان لەدەمی بەجێ هێنانی نوێژدا ، وەك کۆمەڵە ئاوێنەیەکی بێگەردی ڕوو لەیەك ( متقابل )ن کە هەر یەکێکیان تیشكو ڕووناکی یەکەی دەدات بەوانی تر ، کەواتە :

هەر کامێکیان تیشكو ڕووناکی هەموانی تێدا کۆدەبێتەوە هەر بەم بۆیە دانە ڕووناکیو تیشکی دڵو دەروونی دەرەوساوەی هەر کام لەو کۆمەڵە مسوڵمانە گۆڕ بەستوەش بەهۆی ئەو مسوڵمانەی دەوری ، وەك ڕووناکی تیشکی ئاوێنەی گۆرینی لێ دێو ، دوو چەندانەو دە چەندانە دەبێتەوەو ئەو دەورو بەرە پڕ دەبێت لەپیت پێزو بەزەییو ئاشتی .

بێگومان هەر بۆیەش پێغەمبەری بەڕێز صلی الله علیه وسلم هێندە بایەخی بەڕێكو پێکیو ڕاست وەستانو پاڵ وێکدانی ڕیزی نوێژکەران داوە :

[ لتسون صفوفکم او لیخالفن الله بین وجوهکم ] متفق علیه عن ابی عبدالله النعمان بن بشیر .

واتە :

ئەگەر بێتو ڕیزەکانتان ڕێكو پێكو ڕاست نەکەن ، خوا ڕووتان لەیەکتر وەردەگێرێ .

کەواتە : بەڕیز وەستانو ڕێكو پێکی مەرجە بۆ دروست بوونی

برایەتی‌و یەکیەتی‌و یەک ڕیزی‌و تەبایی‌و لەبایی‌و دوور بوون لە دوو بەرەکی‌و ناکۆکی‌و لێک دابڕان‌و پەرتەوازەیی ، جا کەیفێ خۆیەتی ئەو ڕیز بەستن‌و پاڵ لێکدان‌و ڕێک‌و پێکی‌یە ، لەدەمی نوێژو یادی خودا دابێت ، یان لە کاتی جەنگ دابێ :

[ ان الله يحب الذين يقاتلون في سبيله صفا كأنهم بنيان مرصوص • ] الصف ـ ٤ •

واتـە :

خوا ئەوانەی خۆش دەوێن کە لەڕێی وی دا بەڕیز دەجەنگن ، هەر دەڵێی دیوارێکی پێکەوە جوش دراوو قوڕ قوشمیین •

یان لە هەرکاتێکی دیکە دا بێت :

[ ومن مات وهو مفارق للجماعة فأنه يموت ميتة جاهلية • ] رواه مسلم عن عبدالله بن عمر •

واتـە :

وە هەر کەسێک لە کاتێکدا بمرێ کە لە کۆمەڵـی مسوڵمانان ـ جوێ بۆتەوە ـ و لێیان دابڕاوە ـ ئەوە بەمردنێکی نەفامانە مردوە !!(٧)

جا خوایە یارمەتیمان بدە کە بتوانین برایەتی‌و تەبایی‌و یەکیەتیمان بپارێزین ، تاکو بۆمان بلوێ بەمسوڵمانانە بژین‌و بە مسوڵمانانە زیندوو بینەوە نەک بە نەفامانە • ئامین •

---

(٧) لە ئەڵقەی [ کۆمەڵی مسوڵمان ] کە یەکێکی لە ئەڵقەکانی زنجیرەی [ ڕوون کردنـەوەی زاراوە سـەرەکی‌یەکانی ئیسـلام زووربـەی خەسڵەتە بنەڕەتی‌یەکانی کۆمەڵی مسوڵمان نوێژراونەوە •

# بەشی هەشتەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو تێکۆشان (جهاد)

**خوێنەری بەڕێز :**

لە ئەنجامی دوور کەوتنەوەمان لەڕاستەڕێی ژیان ، لەبەر نامەی ئیسلام ، زۆربەی زۆری وشەو زاراوەکانی ئیسلام چەمکو واتای ڕاستەقینەو ڕەسەنی خۆیان لەدەست داوەو چەمکو مەبەستێکی نەرێنی ( سلبی )و بێ گیانیان تێ خزێنراوەو دزێو کراون[1] •

جا یەکێك لەو زاراوە شێوێنراوو دزێو کراوانە ، زاراوەی یادی خوا ( ذکر )یە ، بۆ وێنـە یەکێك لەو چەمكو واتا نەرێنی‌یانەی کـە بەتۆبزی خزێنراوەتە نێو دوو توێی زاراوەی یادی خوا ، ئەوەیە کە یادی خوا دژی تێکۆشان ( الجهاد ) وخەباتە ، وە مرۆڤی خوا یادکەر وادێتە بەرچاوی زۆربەی خەڵکی ، کە بابایەکی بەستەزمانو بێ زەڕو دووره پەریزو بێ کارەو لە گۆشەی مزگەوتێك یان تەکیەو خانەقایەك دا خۆی کوشمەڵە کردوەو سەری کز کردوەو تەسبێحێکی بەدەستەوەیەو جۆتە جیهانێکی خەیاڵی یەوەو لەبەر خۆیەوە هەر گمە گمیەتی !!

بەڵام بەپشتیوانی‌ی کردگاری خاوەن سۆزو بەهێز ، لـەم باسەدا

---

(۱) سوپاس بۆ خـوا ، زنجیـرەی : [ ڕوون کـردنـەوەی زاراوە سەرەکی‌یەکانی ئیسلام ] مان تەرخان کردوە بۆ خستنەوە بەرچاوی زاراوە گرنگەکانی ئیسلام بەشێوەیەکی ڕاستو دروستو دوور لە ژەنگو ژارو گرێو قۆرت •

دەری دەخەین کە ئەو جۆرە بیروٚبۆنە دەربارەی یادی خودا فڕی بەسەر ئیسلامەوە نیەو شتێکی نامۆو نەگونجاوە لەگەڵ سروشتی ئیسلامدا •

بۆو مەبەستەش یازدە ئایـەتی کۆتایی سوورەتی ( آل عمران ) دەکەینە جێی سەرنجو تێوەڕامانمان :

خوای زاناو قسە لەجێ واناو کار بەجێ فەرموویەتی :

[ ان في خلق السموات والارض واختلاف الليـل والنهار لآيات لأولي الالباب • الذين يذكرون الله قياما وقعودا وعلى جنوبهم ويتفكرون في خلق السموات والارض ، ربنا ما خلقت هذا باطلا سبحانك فقنا عذاب النار • ربنا انك من تدخل النار فقد أخزيته وما للظالمين من أنصار • ربنا اننا سمعنا منادياً ينادي للايمان ان آمنوا بربكم فآمنا ، ربنا فاغفر لنا ذنوبنا وكفر عنا سيئاتنا وتوفنا مع الأبرار • ربنا وآتنا ما وعدتنا على رسلك ولا تخزنا يوم القيامة انك لا تخلف الميعاد •

فاستجاب لهم ربهم اني لا اضيع عمل عامل منكم من ذكر او انثى بعضكم من بعض فالذين هاجروا واخرجوا من ديارهم وأوذوا في سبيلي وقاتلوا وقتلوا لأكفرن عنهم سيئاتهم ولأدخلنهم جنات تجري من تحتهـا الانهار ثوابا من عند الله والله عنده حسن الثواب • لا يغرنك تقلب الذين كفروا في البلاد • متاع قليل ثم مأواهم جهنم وبئس المهاد • لكن الذين اتقوا ربهم لهم جنات تجري من تحتها الانهار خالدين فيها نزلا من عند الله ، وما عنـد الله خيـر للأبرار • وان من أهـل الكتاب لمن يؤمن بالله وما انزل اليكم وما انزل اليهم خاشعين لله لا يشترون بآيات الله ثمنا قليلا • أولئك لهم أجرهم عند ربهم ان الله سريع الحساب •

يا أيهـا الذين آمنـوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلكم

تفلحون ] ال عمران ـ ١٩١ ـ الى ٢٠٠ •

واتـه :

[ بەڕاستی لەدروست کرانی ئاسمانەکان وزەوی ـ بوونەوەر ـداو لە جیاوازی ـ واتە : کورتو دریژ بوونو جێ گۆڕکەو هاتنو چوونی ـ شەوو ڕۆژدا ، چەندان بەڵگەو نیشانە هەن ـ لەسەر زانایی‌و بێ هاوتایی‌و دەسەڵاتی خوا ـ بۆ ژیرو خاوەن بیرو هۆشان •

ئەوانەی کە بەپێوەو بە دانشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خـوا دەکەن ، وە بیر لە دروست کرانی ئاسمانەکانو زەوی دەکەنەوە ، ـ ئنجا لە ئەنجامی ئەو یادکردنو بیر کردنەوەیەدا دەڵێن :ـ ئەی پەروەردگارمان ئەم ـ بوونەوەر ـەت بەخۆڕاییی‌و بێ حیکمەت نەخوڵقاندوە ، جا لەسزای ئاگری ـ دۆزەخ ـ بمان پارێزە ، پەروەدگارمان ! بەڕاستی هەر کەسێك تۆ بیخەیە نێو ئاگرەوە ڕیسواو زەبوونت کردوە ، وەکەسیش دەفریای ستەمکاران نایەت • ئەی پەروەردگارمان ! ئێمە گوێ بیستی بانگ کەرێك بوین • بانگی ـ خەڵکی ـ دەکرد بۆ بڕوا هێنان •

دەیگوت : بڕوا بەپەروەردگارتان بێنن ، ئێمەش بڕوامان هێنا ، جا ئەی پەروەردگارمان لە تاوانەکانمان ببوورەو خراپەکانمان بسڕەوەو لەگەڵ چاکان دا بمان مرێنە ، وەئەی پەروەردگارمان ئەوەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەرانت بەڵێنت پێ داوین بمان دەیە بێگومان تۆ گفتت دوا ناخـەی •

ئنجـا پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە ـ گوتی :ـ من کردەوەی

هیچ کام لەئێوە لەنێرو مێ بەزایە نادەم[٢] ، هەمووتان وەک یەکن ، جا ئەوانەی کە کۆچیان کردووەو لەماڵو حاڵیان وەدەرێ نراونو لەپێناوی مندا ئازار دراون ، وە جەنگیان کردووەو کوژراون ، ئەوە خراپەکانیان دەسڕمەوەو دەیانخەمە نێو چەند باغێکەوە ڕووباریان بەبندا دەڕۆن ، ـ ئەوەش ـ پاداشتە لەلایەن خواوە ، خواش چاکترین پاداشتی لەلایە .

باگەڕانو سووڕانی کافرەکان لەوڵاتاندا فریوت نەدات ـ واتە : بە خۆبادانو خۆڕانانی کافرەکان چاو ترساو مەبە ، چونکە ژیانی وان ـ ڕابواردنێکی کاتی کەمەو دوایی جێیەیان دۆزەخە ، بەد ترین جێی تێدا سرەوتنیش ئەوێیە . ئەمما ئەوانەی کە پارێز لە لەروەردکاریان دەکەن ، ئەوە چەندان باغی وا بۆوان هەیە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن ، بەهەمیشەیی تیاندا دەمێننەوە ، ـ ئەوەش ـ میوانداری‌یەکە لەلایەن خواوە ، وەئەوەی لەکن خواش هەیە چاکرە بۆ چاکە کاران .

وە لە خاوەن کتێبەکانیش ـ جوولەکەو دیانو .. هتد ـ ئی‌وا هەیە بڕوای بەخواو بەوەی کەبۆ ئێوە نێرراوە ـ قورئان ـو بەوەی بۆیان

---

(٢) توێژەرەوان دەربارەی هاتنە خواری ئەم ئایەتە ، ئەم فەرموودەیەیان باس کردوە : [ قالت ام سلمة : یا رسـول اللە لا نسمع اللە ذکـر النساء في الهجرة بشيء ، فأنزل اللە تعالی ( فاستجاب لهم ربهم أني لا اضیع عمل عامل منکم من ذکر او انثی بعضکم من بعض ) الی آخر الآیة . ] رواه الحاکم علی شرط الشیخین .
واتە : ( ام سلمة ( هاوسەری پێغەمبەری گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا نابیستین خوا باسی ئافرەتانی کردبێ لە مەسەلەی کۆچ کردندا ، ئنجا خوا ئەم ئایەتەی ناردەخوارێ ، کەواتە : ئەم ئایەتە مەبەستی ئەوەیە کە نێرو مێ لە کردارو پاداشتدا وەک یەکو یەکسانن .
تفسیر ابن کثیر ج١ ص٤٤١ .

بڕزاوه ـ تەوڕاتو ئینجیلو .. هتد ـ هەیە ، لەخوا دەترسێن ، وه ئایەتەکانی خوا بەنرخێکی کەم نافرۆشن ـ واتە : لەپێناوی سوودێکی دنیایی کەمدا دەست بەرداری ئیسلام نابن(٣) ـ ئەوانە لەلای پەروەردگاریان پاداشتی تەواوی خۆیان هەیە ، خواش لە لێپرسینەوەدا بە دەستو بردو خێرایە .

ئەی بڕوا دارینە ! ئارام گربنو لە ئاقار دوژمندا پشوو درێژو خۆڕاگر بنو لەسەنگەر دابنو پارێز لەخوا بکەن ، بەشکم سەرفراز بن . ]

جا ئێستا کە کورتە مانایەکی ئەم دە ئایەتەمان زانی با بەر لەوەی بچینە سەر شی کردنەوەو توێژینەوە دەربارەیان ، چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم سەبارەت بەگرنگیو بایەخی ئەم ئایەتانە بخەینە ڕوو :

یەکەم : [ عەبدوللای کوڕی عەبباس دەڵێت : شەوێکی دوای ئەوەی بەشێک لە شەوگار ڕۆی ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم چۆ دەرێو تەماشای ئاسمانی کردو ئەم ئایەتەی خوێندەوە : [ ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الألباب ] هەتا کۆتایی سوورەتەکە ، ئنجا گوتی :

[ اللهم اجعل في قلبي نورا وفي سمعي نورا ، وفي بصري نورا ، وعن

(٣) بەلآ حەیفی ـ لەم ڕۆژگارەدا ـ بەناو مسولمانو بەناو زانار پێشەوای وا هەن ، کە تەنانەت بۆ چەپڵەو ئافەرینو دەم چەور کردنێك لەلایەن بابایەکی سووکو چرووکو بێ سەنگو کافرو زۆر دارەوە ، خۆیانو ئایینیانو گەلو نیشتمانیان دەفرۆشن !!

يميني نورا ، وعن شمالي نورا ، ومن بين يدي نورا ، ومن خلفي نورا ، ومن فوقي نورا ، ومن تحتي نورا ، واعظم لي نورا يوم القيامة • ] رواه ابن مردويه ابن كثير ج ١ ص ٤٤٠ •

واته : ئەی خوایە ڕووناکی بخە دڵمەوە ، وەڕووناکی بخە بیستنمەوە وە ڕووناکی بخە دیتنمەوە ، وەلای ڕاستم ڕووناك بکەو لای چەپم ڕووناك بکە ، وەڕووناکی بخە پێشمەوەمو ڕووناکی بخە دواوەم ، وە سەرووم ڕووناک بکەو خواروومم ڕووناک بکە ، وەڕۆژی دوایی ڕووناکیم زۆر بدەیە ] •

دووەم : [ دیسان عەبدوڵلا دەڵێت : شەوێکی لەلای ( میمونة )ی هاوسەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم مامەوە ــ واتە لەلای پووری ( خوشکی دایکی ) ــ دەڵێت : من لەسەر باری پانی ڕایەخەکە ڕاکشامو پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم نووست هەتا شەو بەنیوەیی بوو ، یان پێش ئەوە یان دوای ئەوە بەکەمێك ، پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەخەوەکەی بیدار بۆوەو دەستی بەدەمو چاویدا هێنا بۆوەی خەواڵوویی بەری بدات ، ئنجا دە ئایەتی کۆتایی بەسوورەتی ( آل عمران ) خوێند ، دوایی هەستا چوو بۆلای کوندەیەکی هەڵواسراوو دەستنوێژی لێ گرت ، دەستنوێژێکی چاك ، ئنجا هەستا نوێژێ بکا ، ــ عەبدوڵلا دەڵێ ــ منیش هەستام ئەو چی کردبوو وام کرد ، ئنجا چووم لە تەنیشتیەوە ڕاوەستام ، جا پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دەستی ڕاستی خستە سەر سەرمو گوێی ڕاستمی گرتو بای دا ، ئنجا دوو ڕکات نوێژی کرد ، دوایی دوو ڕکاتی دیکە ، دوایی دوو ڕکات ، دوایی دوو ڕکات ، دوایی دوو ڕکات ، دوایی دوو ڕکات ، ئنجا ڕکاتێکی کرد ، دوایی ڕاکشا هەتاکو بانگ بێژ

هانه لای ئنجا هەستا دوو ڕکات نوێژی سووکی کرد ، دوایی چۆ دەرێو نوێژی بەیانی کرد • ] رواه البخاري ومسلم والنسائي والترمذي وابو داود وابن ماجه ابن كثير ج ١ ص ٤٤٠ •

سێیەم : [ عەطاء دەڵێ : من‌و عەبدوڵلای کوڕی عومەرو عوبەیدی کوڕی عومەیر چونیەلای عائیشە خوا لێی ڕازی بێ ، ئنجا لێی وەژوور کەوتین‌و لەنێوان ئێمەو ویدا پەردە هەبوو ، عائیشە گوتی : ئەی عوبەید چ شتێك پێشگیریت لێ دەکات کـە سەرمان لێ بدەی ؟ گوتی قسـەی شاعیر : ( زر غبا تزدد حباً ) درەنگ درەنگ سەردان بکە ، خۆشەویستر دەبی • عەبدوڵلای کوڕی عومەر گوتی : دایکی بڕواداران وازمان لێ بێنە ، هەوالمان پێ بدە بەسەر سووڕهێنەر ترین شت کە لە پێغەمبەری خوات دیوە ! عائیشە گریاو گوتی : هەموو شتێکی هەر سەیر بوو ، شەوێکی هانەلام هەتا پێستی وەپێسم کەوت ، ئنجا گوتی : لێم گەڕێ بچم پەروەردگاری دەسەڵاتدارو بەسامم بپەرستم ، عائیشە دەڵێ : گوتم : بەخودا پێم خۆشە لێم نیزیک بی ، وەحەزیش دەکەم کە پەروەردگارت بپەرستی ، ئنجا هەستا چوو بۆلای گۆزەیەك‌و دەسنوێژی گرت بەلام ئاوی زۆر نەڕشت ، دوایی هەستا دەستی بە نوێژ کردنێ کردو گریا ، هەتا ڕدینی تەڕبو ، ئنجا کڕنووشی بردو گریا هەتا زەوی تەڕ کرد ، ئنجا ـ واتە دوای نوێژ کردنێ ـ لەسەر کەلەکەی درێژ بوو گریا هەتا کاتێك کە بیلال هات ئاگاداری بکات بۆ نوێژی بەیانی ، بیلال گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا چ وات لێ دەکات بگریەی خۆ خوا لەتاوانی ڕابردووو داهاتووت خۆش بوە ؟! گوتی : بێ‌بەڵابی بیلال ! جا چۆن نەگریەم کە

---

(٤) مەبەستی یاری لەگەڵ کردن‌و لاواندنەوە بووە •

ئەمشەو خوا : [ ان في خلق السموات والارض واختلاف الليل والنهار لآيات لأولي الالباب ]ی بۆ ناردووم ؟!!

ئنجا ـ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم ـ فەرمووی : ( ویل لمن قرأها ولم یتفکر فیها ٠ ) بەڵا لەو کەسەی دەیخوێنێتەوەو لێی ورد نابێتەوە ٠ ] رواه ابن مردویه ، وهکذا رواه ابن ابي حاتم وابن حبان / تفسیر ابن کثیر ج ١ ص ٤٤٠ ٠

خوێنەری خۆشەویست و بەرێز :

ئێستا کاتی ئەوەی هاتوە کە لەبەر تیشکی ئەم ئایەتانەدا پەیوەندی نێوان یادی خوداو تێکۆشان لەرێی خوادا بخەینە ڕوو :

پەیوەندی نێوان یادی خواو جیهاد لەبەر تیشکی یازدە ئایەتی کۆتایی سوورەتی ( آل عمران )دا :

لە پێنج ئایەتی یەکەم دا واتە (١٩٠ ، ١٩١ ، ١٩٢ ، ١٩٣ ، ١٩٤) دەبینین خوای زانا باسی ئەو موسوڵمانە دەکات کە بیر تیژو وردو بەدیقەتن و هەروا بەسەر پێیی ناڕوانە دەورو بەریان ، بەڵکو تێیەوە رادەمێنن و لێی ورد دەبنەوە ، ئنجا دێتە سەر باسی ئەوەی کە ئەو مرۆڤە تێگەیشتووو وردبین و ژیرانە کەسانێکن(٥) دایم و دەرەم لەیادی خوادان ، چ بەپێوەبن چ بەدانیشتنەوە ، وە چ بەراکشانەوە ، واتە : لەهەموو

---

(٥) بەڵێ بەڕاستی لەنێوان بیرکردنەوەو وورد بوونەوەو یادی خوا دا پەیوەندی‌یەکی پتەوو بەتین هەیە ، چونکە بەس مرۆڤێك بەڕاستی یادی خودا دەکات کە بیر بکاتەوەو لەشت ورد بێتەوەو تێ بگات ، ئەمە لەلایەکەوە ، لەلایەکی دیکەشەوە هیچ کاتێك یادی خوا بەبێ بیر کردنەوەو وورد بوونەوە نایەتەدی ، ئاخر هەزار کەڕەت وشەی ( الحمد لله )و ( الله اکبر ) گۆ ( تلفظ )بکەی ، مادام بیریان لێ

حالان‌دا خوایان له‌بیره‌و یادی ده‌ده‌ن • ئنجا خستوویه‌ته ڕوو که ئه‌و خواناسه ژیرانه له ئه‌نجامی بیرکردنه‌وه‌و یادی خوادا ڕوو ده‌که‌نه په‌روه‌ردگاریان‌و ده‌ڵێن : ئه‌ی په‌روه‌ردگار ! تۆ ئه‌م بوونه‌وه‌ره‌و ئه‌م زیانه‌ت به‌بێ حیکمه‌ت‌و هۆ دروست نه‌کردوه ، به‌ڵکو بۆیه خوڵقاندووته که ئینسانی تیدا تاقی بکه‌یه‌وه ، جا مادام وایه یاریده‌مان بده له‌م تاقی کردنه‌وه‌یه ده‌ربچین‌و تووشی سزاو ئه‌شکه‌نجه‌ی ئاگری دۆزه‌خ نه‌بین •

ئنجا دوای ئه‌وه‌ی دانی پێدا دێنن که هه‌ر که‌سێك خوا بیباته نێو ئاگری دۆزه‌خه‌وه ڕیسواو زه‌بوون‌و شه‌رمه‌زار ده‌بێت ، ڕوو ده‌که‌نه

---

نه‌که‌یه‌وه‌و به‌ر له‌وه‌ی به‌زار بیانڵێی به‌دڵت دا ڕه‌ت نه‌بن ، وه‌کو هیچت نه‌کردبێ وایه •

ئنجا باقسه‌ی چه‌ند زانایه‌کیش له‌و باره‌وه باس بکه‌ین :

١ ـ [ عیسی ] علیه السلام ده‌ڵێت : خۆشی بۆو که‌سه‌ی که قسه‌ی یادی خوا بێ‌و ، بێ ده‌نگی بیرکردنه‌وه بێ‌و ، ڕوانینی په‌ند وه‌رگرتن بێ •

٢ ـ [ ابن عباس ] ده‌ڵێت : دوو ڕکاتی نوێژی کورت به وردبوونه‌وه‌وه باشتره له‌نوێژی شه‌وێك که دڵ بێ ئاگا بێت •

٣ ـ [ حسن البصري ] ده‌ڵێت : بیر کردنه‌وه‌ی سه‌عاتێك چاکتره له‌شه‌و نوێژی شه‌وێك •

٤ ـ [ عمر بن‌عبدالعزیز ] ده‌ڵێت : بیر کردنه‌وه له‌نازو نیعمه‌ته‌کانی خوا گه‌وره‌ترین خدا په‌رستی‌یه •

٥ ـ [ ابو سلیمان الدراني ] ده‌ڵێ : من که له‌ماڵێ ده‌چمه ده‌رێ هه‌رچی چاوم پێ‌ی بکه‌وێ نیعمه‌تێکی خوای تێدا ده‌بینم‌و په‌ندێکی لێ وه‌ر ده‌گرم •

تێ‌بینی : ئه‌م قسانه‌م له [ تفسیر ابن کثیر ] وه‌رگرتن ج١ ص٤٣٨ •

خواو دەڵێن :

ئێمە گوێمان لە بانگەوازی پێغەمبەر بوو کە خەڵکی بانگ دەکرد بۆ بڕوا هێنان بە هەموو شتێك ، بەخوا ، بەپێغەمبەر ، بە قورئان ، بەڕۆژی دوایی ، بەفریشتان ، بەقەزاوقەدەر .. هتد .

ئێمەش بە دەم بانگەوازی‌یە کەیەوە هاتین‌و بڕوامان هێنا ، جا خوایە گیان لە تاوانە کانمان ببوورەو خراپە کانمان لەسەر لابەرەو لەگەڵ بڕوا دارانو خوا ناساندا بمان مرێنە ، وە ئەی خوایە ! لەدوا ڕۆژدا ئەوەی کەلەسەر زمانی پێغەمبەرانت گفتت پێ داوین ـ کە بریتیە لە شاد بوون بەڕەزامەندی خواو گەیشتن بە بەهەشتی بەرین ـ پێمان ببەخشە ، چونکە تۆ گفتو بەڵێنت ڕاستەو بەدرۆ دەرناچێ .

بێگومان هەتا ئێرە ـ کە کۆتایی پێنج ئایەتی یەکەمە ـ بەس بیرکردنەوەو ڕامانو یادی خواو پاڕانەوەو نیاز بوو ، هەر دڵسۆزیو بەندایەتیو گەردن کەچی خستنە ڕوو بوو ، بەس دەر بڕینی هەستو بەستی خوا ناسانەی نەرمو ناسكو ، سۆزو خۆشەویستی گەرمو بەتینو ، لالانەوەو کڕووزانەوەو سکاڵای پڕ ترسو لەرز بوو و ، داوا کردنی چەپاڵەدرانو پاریزرانو قوتار کران لە ئاگری دۆزەخو شاد بوونو گەیشتن بە نازو نیعمەتی بێ سنووری بەهەشتی بەرین بوو ، بەڵام ؟

بەڵام ئایا خوا هەر بەوەندە ڕازی دەبێ ؟!

وە ئایا ئیسلام بەڕێوە بردن بەس بەوەندەی پێك دێ ؟!

وە ئایا بابای ژیرو تێگەیشتووو هەردەم خوا لەیاد تەنیا بەوەندەی دڵی ئاوێ دەخواتەوەو واز دێنێ ؟!

شەش ئایەتی دووەمی ئەم یازدە ئایەتە وانە : (١٩٥ ، ١٩٦ ، ١٩٧ ، ١٩٨ ، ١٩٩ ، ٢٠٠) وەڵامی ئەو پرسیارانە بە ( نەء ) دەدەنەوە •

بەڵێ نە خوا بەس بەوەندە ڕازی دەبێو نە ئیسلام تەنیا بەوەندەی بەڕێوە دەبرێو ، نەمسولمانی ژیرو بیر تیژو هەمیشە خوا لەیادو دڵ پڕ بەبڕواش بەس بەوەندە واز دێنێ •

بۆیە دەبینین خوای قسە لەجێو زانا یەکسەر دوا بەدوای ئەو کوڵو کۆ بەتینەو ئەو ڕازو نیاز دەربڕینە دەڵێت : [ فاستجاب ربهم اني لا اضيع عمل عامل منكم ] •

واتە : پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە ، من کردەوەی هیچ بیشکەرێک لە ئێوە بەزایە نادەم •

بێگومان بەم ڕستەیە سەرنجی بۆ ئەوە ڕاکێشان کە ئەوەی لە کن خوا بایەخو سەنگی هەبێ بریتیە لە کردەوە ( عمل ) ، هەر بۆیەش لەباتی وەی بلێ : ( قول قائل ) یان ( عمل قائل ) فەرموویەتی : ( عمل عامل ) ، بۆ ئەوەی بزانن کە خوا دەیەوێ هەر کەسێك خۆی بە بەندەی وی بزانێ ، بەکردەوە دەری خات کە بەندەی خوایە ، نەک بەس بەقسە •

بەڵێ مسولمانی ڕاستەقینە ئەوەیە کە شیری کردەوان بێ نەك ئی قسان ، وە بەر لەوەی زمانی بێتە کۆ کردەوەو ڕەفتارو ئاکارەکانی قسان بکەن[٦] •

---

(٦) نەك وەك زۆربەی مسولمانو بەناو مسولمانانی بێ ئاگای ئەم ڕۆژگارە . کە پێیان وایە تەنیا بەدووبارە کردنەوەی ڕستەی ( لا اله

دوایی بۆوەی بۆیان ڕوون بکاتەوە کە لەئیسلامدا کێ کردەوەی چاکی زۆر بێ ، ئەو کەسە کرەوی خۆی بردۆتەوەو بەڕەی خۆی لە ناوێ دەرێناوەو ، لەم بارەوە ئافرەتو پیاو هیچ جۆرە جیاوازی‌یەکیان ئەو یەکسانن ، فەرموویەتی :

[ من ذكر او انثى بعضكم من بعض ] .

ئنجا بە بۆنەی ئەوەوە کە باسی کردەوەی کرد ، دێتە سەر باسکردنی چەند کردەوەیەکی یەکجار گەورەو کاریگەر ، کە لووتکەی (٧)

---

الا الله ، محمد رسول الله ) دەچنە ڕیزی مسوڵمانانەوەو بەهەشتی خوا مسۆگەر دەکەن !! بێ ئاگا لەوەی کە تەنانەت ڕێچکەو پێڕە دەستکردە شەیتانی‌یەکانیش ، هەر بەوەندە ڕازی نابن‌و دەبێ سیخوڕی‌و مرۆڤکوژی‌و دزی‌و فزی‌یان بۆ بکەن‌و ئابوونە بدەن‌و کۆ بوونەوەیان لەگەڵ بکەن کە سەرێشیان‌تێیان وەستا دەست بەرداری گیان‌و سامان‌و منداڵ‌و زۆر جاران نامووسیشیان بن ، لەپێناویاندا !!

جا نازانم ئەو بەناو مسوڵمانە گێلانە بۆ دەبێ بیر لەوە نەکەنەوە کە شتێك ـ کەبریتیە لە قسەی ڕووت ـ ڕێچکەو پێڕێکی پووچی شەیتانی پێی ڕازی نەبێ چۆن بەرنامەی پەروەردگاری جیهان پێی قایل دەبێ ؟!!

بەڵێ ئەو سادەو نەفامانە پێیان وایە کە [ شایەتمان هێنان ]کلیلی دەرگای بەهەشتەو بەس بەگو ( تلفظ ) کردنی دەرگا لێکرانەوەی بەهەشتێ مسۆگەر دەکەن ، بێ ئاگا لەوەی کە هەموو کلیلێك دوانی هەن‌و کلیلی بێ ددان دەرگای پێ ناکرێتەوەو ددانی ئەو کلیلەی ئەوانیش پشتیان پێ بەستوە ڕەفتار کرنە بەپێی وی !!

(٧) ( وذروة سنامه : الجهاد ) رواه الترمذي عن معاذ .
واتە : وە لووتکەی هەرە بەرزی ئیسلام تێکۆشان‌و خەباتە .

هەرە بەرزی ئیسلام پێک دێنن ، واتە : تێکۆشان ( الجهاد ) ، وە ئەو کردەوەو حەسڵەتە گەورەو کاریگەرانە لە هەموو چاخو سەردەمێکیش دا سەنگی مەحەک‌و تەرازووی هەڵسەنگاندنی بڕوای بڕواداران ، دەفەرموێ :

[ فالذين هاجروا وأخرجوا من ديارهم واوذوا في سبيلي وقاتلوا وقتلوا ؛ لأكفرن عنهم سيئاتهم ولأدخلنهم جنات تجري من تحتها الانهار ثوابا من عند الله والله عنده حسن الثواب • ]

بێگومان لە پێنج ئایەتی یەکەم دا بڕواداران پاش ئەوەی هەست‌و نەست‌و سۆزو دڵسۆزی‌و بەندایەتی خۆیانیان بۆ پەروەردگار دەربڕی ، داوای دوو شتیان لێ کرد :

یەکەم : چاو پۆشی کردن بەتاوانە کانیان‌و پاک بوونەوەیان •

دووەم : شاد بوونیان بەوەی خوا بەڵێنی پێ داون ، کە خوا لێ ڕازی بوون‌و بەهەشتی بەرینە ؛ [ ربنا فاغفر لنا ذنوبنا وكفر عنا سيئاتنا •• ربنا وآتنا ما وعدتنا على رسلك ] •

جا ئێرەدا خوای زاناو بەخشندە هەر دوو داوایەکەی بۆ جێ بەجێ بردوون ، بەڵام پێنج مەرجی دیاری کردوون‌و کردوونی بە نرخ‌و دەستمایەی ئەو ئامانجەی کە بەدوایدا وێڵن :

یەکەم : ( فالذين هاجروا ) = کۆچ کردن لەپێناوی خواداو بەجێ هێشتنی ماڵاو دارایی‌و نیشتمان لەکاتی پێویستیدا •

دووەم : ( وأخرجوا من ديارهم ) = دەست بەردار بوون لەهەموو سامان‌و دارایی‌و بەرژەوەندییەک ، وەک خانوو بەرەو زەوی وزار •

سێیەم : ( وأوذوا في سبيلي ) = ئازارو ئەشکەنجەو چەرمە سەری دیتن لەڕێی خوادا .

چوارەم : ( وقاتلوا ) = جەنگ کردن لەڕێی خوادا .

پێنجەم : ( وقتلوا ) = کوژرانو شەهید بون لەپێناوی خوادا .

کەواتە : هێنانەدی ئەم پێنج مەرجە لەگەڵا بەس خـوا مەبەست بوونو ( اخلاص )و خۆ یەکلا کردنەوە بۆ خوا ، نرخی چوونە بەهەشتو لە تاوان پاك بوونەوەو بەڕەزامەندی خودا گەیشتنە ، هەروەك چۆن لەزۆر جێی دیکەدا پەنجە بۆ ئەم ڕاستی‌یە درێژ کراوە ، بۆوێنە :

[ ان الله اشترى من المؤمنين أنفسهم وأموالهم بأن لهـم الجنـة ، يقاتلون في سبيل الله فيقتلون ويقتلون .. ] التوبة - ١١١ .

واتە : خودا گیانو سامانی لەبڕواداران کڕیوە ، کە بەهەشتیان بداتێ ، لەڕێی خوادا دەجەنگن ، دەکوژنو دەکوژرێن .

بەڵێ ئەو پێنج مەرجە پێویستن بۆ هەرکەسێك کە خولیاو کەڵکەڵەی چوونە بەهەشتی لەسەردا هەیە ، بۆیـە لەکۆتایی ئایەتەکە - ئایـەتی شەشەمی ئەم یازدە ئایەتە - دەفەرموێ :

[ لأكفرن عنهم سيئاتهم ولأدخلنهم جنات تجري من تحتها الأنهار ثوابا من عند الله والله عنده حسن الثواب . ]

واتـە :

ئەوانەی کە ئەو مەرجانەیان تێدا هاتبنەدی ، یان[8] ئامادەبن کە

---

(٨) بەڵێ مرۆڤی مسولمان هەرچەندە بەکردەوەش ئـەو خەسڵەتانەی

بیان هێننەدی ، خوا دەفەرموێ : ئەوانە تاوانەکانیان لێ دەسڕمەوە ، وە دەیانخەمە نێو چەند باغێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن ، ئەوەش پاداشتێکە لەلایەن خواوە ، خواش چاکترین پاداشتی لەلایە .

ئنجا خوای بێ هاوەل لەئایەتی (٧ و ٨)دا ڕوو دەکاتە پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم هەر مسوڵمانێکی دیکەش کە خۆی بەهەڵگری ئالای قورئان دادەنێو پێی دەلێ :

بەگەڕانو سووڕانو هاتنو چوونو خۆ بادانی کافرەکان چاوت نەترسێنو فریو مەخۆ ، چونکە ئەوانە ژیانێکی کەم لەدنیادا بەڕێ دەکەن، دوایی لە دۆزەخ دا کە بەدترین ڕێو جێیە خۆیان دەبیننەوە .

لە ئایەتی نۆیەمیش‌دا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوانەی خاوەن پارێزنو گەردن کەچن بۆ ئاینو بەرنامەی خوا ، لەدوا ڕۆژدا دەبرێنە نێو چاکترینو خۆشترین باغو گوڵزارو کانیو ڕووبارەوەو بۆ هەمیشە لەو نازو نیعمەتو خۆشگوزەرانی‌یەدا دەمێننەوە کە خوا بۆ بەندە بەنمەکو چاکەکانی ساز کردوە .

لە ئایەتی دەیەمیش‌دا ڕای دەگەیەنێ کە ئاینی ئیسلام وەک

---

تێدا نەهاتبێتەدی ، بەڵام مادام نیازی دڵی خۆی لەسەر ئەوە ساغ کردبێتەوە ، کە هەرکاتێك ئەو هەلنەناوانەی هاتنە بەرێ بێ سێو دوو بیان نێ ، ئەوە هەر وەبەر موژدەی ئەو ئایەتە دەکەوێ ، چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی :

[ من مات ولم يغزو ولم يحدث به نفسه مات على شعبة من نفاق . ]

رواه ابو داود والنسائي عن ابي سعيد الخدري / تاج الاصول ج٤ ص٣٢٩ .

یانی هەرکەسێك بمرێو جیهادی نەکردبێو نیازیشی نەبووبێ بیکات ، ئەوە لەسەر بەشێك لەبەشەکانی مونافیقیو دەغەلی مردوە .

ڕنچکەو بیرەکانی دیکە نیە کە لەبەر بەرچاو تەنگیو کورت بینی مەودا بەخۆی نەدات بیر لەکەس بکاتەوە ، بەڵکو ئیسلام بەوپەڕی سینگ فراوانیو سوپاسکردنەوە ڕوو لەهەر کەسێك دەکات ـ جاسەر بەهەر پیرو تاقمێك بووبێ ـ کە دەگەڕێنەوە نێو باوەشی گەرمیو بن باڵی پرسۆزیو ، دەبێتە سەربازو شوێن کەوتووی • وە دەیخاتە ڕوو کە ئەوانەش خاوەنی پاداشتی خۆیانن لە لای پەروەردگاریان •

ئنجا دێتە سەر ئایەتی یازدەمو کۆتایی :

[ يا أيها الذين آمنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلكم تفلحون ] •

واتە : ئەی بڕوا داریە ! ئارام گربنو ـ لە ئاقار دوژمندا ـ خۆڕاگرو پشوو درێژ بنو لە سەنگەر دابنو پارێز لە خوا بکەن ، بەشکم سەرفرازبن •

پێشەکی بابزانین توێژەرەوان چۆن ئەم ئایەتەیان ڕافە کردووە ، دوایی دێینەوە سەر مەبەستی بنچینەیی :

یەکەم : پێشەوای توێژەرەووان ( محمد بن جرير الطبري ) گوتوویەتی :

[ ( اصبروا ) على دينكم ( وصابروا ) الكفار على الجهاد ( ورابطوا ) أعداءكم ، أصل الرباط : ارتباط الخيل • ثم استعمل في كل مقيم في ثغر يدافع عنه سواء أكان ذا خيل ام ذا رجلة لا مركب له وهو ههنا الجهاد ][٩] •

(٩) ( مختصر تفسير الطبري ) ص٨٣ •

واتــه :

( اصبروا )یانی ئارام بگرن لەســەر ئاینەکــەتان ، ( وصابروا )

یانی : وەخۆڕاگری بکەن لە بەرانبەر کافرەکان لەکاتی جەنگدا .

( ورابطوا ) یانی : وە بۆ دوژمنانتان لەسەنگەر دابن . ( رباط )

بەبنەڕەتدا یانی : ئەسپ بەستنەوە ، دوایی بەکار هێنراوە بۆ هەر کەسێك

کە لە سنوورو سەنگەرێك دایە بەرگری دەکات ، جا ئەسپی پێ بێ یان

پێڕۆ بێو ولاخی سواری پێ نەبێ ، وە ( رباط ) لێرەدا بریتیە لە جیهاد .

دووەم : [ ابن کثیر ] دەڵێت : حەسەنی بەسرایی گوتوویەتی :

فەرمانیان پێکراوە کە لەسەر ئەو ئاینەی خوا بۆی هەڵبژاردوون ئارام

بگرن ، کە ئیسلامەتی یە ، نە بۆ خۆشیو نە بۆ ناخۆشی وازی لێ نەیەنن ،

وەنە بۆ توندو تیژیو نە بۆ خۆشگوزەرانی ، هەتا بەمسوڵمانەتی دەمرن ،

وە لەبەرانبەر ئەو دوژمنانەیاندا کــە دەیانەوێ ئاینەکەیان بکوژێننەوە

خۆڕاگرو پشوو درێژ بن ، زۆر لەزانایانی پێشین هەر ئاوایان گوتوە .

بەڵام (المرابطة ) ئەوە بریتیە لە بەردەوامیو خۆ ڕاگری لە شوێنی

خــوا پەرستی دا ، وەگوتراوە : بریتیە لە چاوەڕوان کردنی نوێژ لــە

دوای نوێژ .

ئنجا ( ابن کثیر ) دەڵێ : وەگوتراوە مەبەست لە ( مرابطة ) لێرەدا

ڕاوەستانە بۆ جیهاد لە پێش سینگی دوژمن ، وە پاراستنی سنوورەکانی

ئیسلامو بەرگری لێ کردنیــەتی ، لەوەی کەدوژمن بێنــە نێو نیشتمانی

مــوسڵمانانەوە(١٠) .

---

(١٠) ( تفسیر ابن کثیر ) ج١ ص٤٤٤ .

سێیەم : ( حافظ‌الدین عبدالله بن احمد النسفي ) ئاوا ئەم ئایەتەی تەفسیر کردوە :

( یا ایها الذین آمنوا اصبروا ) یانی : ئەی بڕوادارینە ئارام بگرن لەسەر بەڕێوە بردنی ئایین‌و ئەرکەکانی ، ( جنید ) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی : ( صبر ) ڕاگرتنی نەفسە لەسەر ناخۆشی بێ هەڵپە هەڵپ ، ( وصابروا ) یانی : خۆڕاگر بن لەسەر جەنگی دوژمنانی خوا ، واتە : لەخۆڕاگری‌ی‌دا لەسەر ناخۆشی‌یەکانی جەنگ بیان بەزێنن‌و لەوان بێ ئارام‌تر و خۆڕاگرتر مەبن ، ( ورابطوا ) وە لەسەر سنوورەکان سەنگەر بگرن‌و ئەسپەکانتان ڕاگرن‌و ئامادەو چاوەڕوانی جەنگ بن ، ( واتقوا الله لعلکم تفلحون ) [ الفلاح البقاء مع المحبوب بعد الخلاص من المکروه ][11] یانی : ( فلاح )[12] بریتیە لە مانەوە لەگەڵ خۆشەویستدا دوای ڕزگار بوون لەناخۆشی .

ئێستا با بگەڕێینەوە سەر مەبەستی بنچینەیی باسەکەمان : لەم ئایەتەدا خوای زانا داوای لەبڕواداران کردوە کە بۆ وەدەست هێنانی ڕزگاری‌و سەرکەوتن‌و بە ئاوات گەیشتن چوار خەسڵەتی سەرەکی

---

(11) ( تفسیر النسفي ) ج1 ص340 .

(12) راغب الاصفهاني دەربارەی وشەی فلاح گوتوویەتی : الفلاح : یانی : سەرکەوتن‌و بەئامانج گەیشتن ، ئەویش دوو جۆرە : دنیایی‌و دوا ڕۆژی . ئی دنیایی بریتیە لە وەدەست هێنانی ئەو شتانەی کە ژیانی دنیایان پێ خۆش دەبێ ، وەك : مانەوەو دەوڵەمەندی‌و [illegible] ، ئی قیامەتییش چوار شتە : مانەوەیەکی بێ مردن ، دەوڵەمەندی‌یەکی بێ نەداری ، دەسەڵاتێك کە ژێر دەستەیی ڕێی تێ نەچێ ، زانیاری‌یەك کە نەزانی تێکەڵ نەبێ . معجم مفردات الفاظ القرآن ص399 .

لەخۆیاندا بێنەدی ، یەکەم : ئارام گری ، دووەم : خۆ ڕاگری لەئاقار دوژمن دا ، سێیـەم ، ئامادە بوونو لـە سەنگەر دابوون ، چوارەم : پارێز کردن لەخوا •

کـەواتە :

ئەم ئایەتە بەتەنیا ، بەرنامەیەکی تەواوە سەبارەت بەخستنەڕووی هەڵوێستی مرۆڤی مسوڵمانو جۆنیەتی پەیوەندییەکانی لەژیانیدا •

چونکـە مسوڵمانان سێ جۆرە پەیوەندییان هـەیە لـەژیانیاندا ، پەیوەندیان لەگەڵ نەفسی خۆیاندا ، وە پەیوەندییان لەگەڵ دوژمناندا ، وە پەیوەندییان لەگەڵ خوادا •

**یەکەم : پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خۆیدا :**

**جۆری** پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خۆیدا وشەی ( **اصبروا** ) « ئارام گر بن » ڕوونی دەکاتەوە ، چونکـە مسوڵمان پێویستە هەمیشە **لەگەڵ** نەفسو ئارەزووەکانیدا لەجـەنگ دا بێو نەیەڵێ نـەفسی تێر **نەخۆری**[١٣] تووشی تاوانو سەرپێچی بکاتو خوای بەرزی لێ **تووڕە** بکـات •

بۆیەش پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم فەرموویەتی : [ والمجاهد من جاهد نفسه في الله ] رواه الترمذي وابن حبان تربيتنا الروحية : سعيد حوى ص١٣٢ ط١ •

---

(١٣) ( ٠٠ واعوذ بك من نفس لا تشبع ٠٠ ) رواه الترمذي والنسائي عن ابن عمر •

واتە : وەپەنا بەتۆ دەگرم ـ ئەی خوایە ـ لە نەفسێکی تێر نەخۆر •

واته : جەنگاوەرو تێکۆشەر ئەو کەسەیە کە لەگەڵ نەفسی خۆیدا لەپێناوی خوادا دەجەنگێ •

دیسان پێغەمبەری بەڕێزمان فەرموویەتی : [ أعدى عدوك نفسك التي بين جنبيك ] رواه البيهقي ترتيبنا الروحية •

واتـە :

گەورەترین دوژمنت ئـەو نـەفـسـەتە کـە کـەوتۆتە نێوان دوو تەنیشتەکانت •

**دووەم : پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ دوژمنانی خوا دا :**

پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ دوژمنانی خوادا ، دوو وشەی ( وصابروا ورابطـوا ) ڕوونی دەکەنـەوە ، چونکـە مرۆڤی مسـوڵمان لەبەرانبەر دوژمنانی ئایین‌دا لەدوو حاڵان بەولاوە نیە :

یان لەحالەتی جەنگ دایە ، یان نا ، جا ئەگەر لە حاڵەتی جەنگ دابێت ئەوە وشەی ( صابروا ) فەرمانی پێ دەکات کە بەسەر دوژمنان دا زاڵ بێ‌و لەوان پشوو درێژترو بەورەترو خۆ ڕاگرتر بێ‌و ، بیان بەزێنێ‌و بەسەریاندا سەرکەوێ •

وە ئەگەر لەحاڵەتی جەنگیش دا نەبێ ، ئەوە وشەی ( رابطوا ) فەرمانی پێ دەکات کە ئاگای لە دوژمنـان بێ‌و لێیان لەسەنگەر دابێ‌و هەمیشە سازو ئامادە بێ‌و پێداویستی‌یەکانی جەنگیان بۆ ساز کات ، چونکە ڕێك کەوتن‌و ئاشتی لەنێوان ئیسلام‌و کوفـر دانیـەو ، ئەگـەر کوفـر بەڕواڵەتیش وا پیشان بدات کەنیازی خراپی نیە ، ئەوە بەهیچ جۆرێك جێی دڵنیایی‌و متمانە پێ‌کردن نیەو ، هەر کاتێك هەلی لێ هەڵکەوێ ،

ئاوێی لێ ناحواتەوەو هــەرچی ئەدەستی بێ لەگــەڵ بەرەی بڕوادا دەیکات •

هەڵبەتە دەقی ئیسلامیش زۆر زۆرن سەبارەت بە جیهادو تێکۆشان لــە ڕێی خوا دا ، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئێرە جێی تەرخان کراوی ئەو باسە نیە ، بەچەند نموونەیەک وازی لێ دێنین :

١ ــ [ عينان لا تمسهما النار ، عين بكت من خشية الله وعين باتت تحرس في سبيل الله ] رواه الترمذي والنسائي عن ابن عباس تاج الأصول ج٤ ص٢٣٦ •

واتە : دوو چاو ئاگریان تووش نابێ ، چاوێك كە لەترسی خــوا گریابێ ، وە چاوێك كە بەشەوێ ئێشکەی گرتبێ لەرێی خوادا •

٢ ــ [ رباط يوم في سبيل الله خير من الدنيا وما عليها • ] رواه البخاري والترمذي عن سهل • / تاج ج٤ ص (٢٣٦) •

واتە : یەک ڕۆژ جیهاد کردنو چوونە سەنگەر ، لەپێناوی خوادا باشترە لەدنیاو لەوەی لەسەریەتی •

٣ ــ [ حرس ليلة في سبيل الله أفضل من ألف ليلة يقام ليلها ويصام نهارها • ] رواه احمد عن عثمان بن عفان تفسير ابن كثير ج١ ص٤٤٥ •

واتە . یەک شەو ئێشکە گرتن لەڕێی خوادا گەورەترە لە هەزار شــەو کــە شەو نوێژیان تێدا بکرێو ڕۆژەکانیشیان ڕۆژوویان تێــدا بگیرێ •

جۆری پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خوادا ، وشەی ( واتقوا الله ) دەری دەخات ، چونکە ڕاست ترین پەیوەندی بەندە لەگەڵ خوای

خۆیدا بریتیە لەوەی کە هەمیشەو بەردەوام پارێزی لێ بکاتو هەست بە چاوە دێرێی بکاتو ئاگاداری خۆی بێت کارێکی وانەکات ، یان قسەیەکی وای لەزاری دەرنەچێ ، یان نیازو مەبەستێکی وای لە دڵ دا جێگیر(١٤) نەبێ ، کە ببێتە هۆی دوورە بوونی خوا ، چونکە پارێزکاری ( تقوی ) بریتیە لە پاراستنی نەفس لەهەر شتێك کە پێی تاوانبار دەبێت(١٥) ، ئەوەش بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانو دوور کەوتنەوە نە قەدەغە کراوەکان دەبێ •

هەڵبەتە دیارە وەدەست هێنانی خەسڵەتی پارێزکاری ( تقوی )یش ئاسان نیە بۆیە پێغەمبەری پێشەواو پارێزکار فەرموویەتی : [ اللهم آت نفسي تقواها وزكها أنت خير من زكاها ، أنت وليها ومولاها • ] رواه مسلم •

واتە : ئەی خوایە پارێزکاری بە نەفسم ببەخشە ، وەپاکی بکەوە تۆ باشترین کەسی کە پاکی بکاتەوە ، هەر تۆی سەر پەرشتی کەرو گەورەو سەرۆکی وی •

ئنجا لە کۆتایی دا خوای باڵا دەستو زانا دەفەرموێ : ( لعلكم تفلحون ) بەشکم سەرفراز بنو ئاواتی دنیاو دوا ڕۆژتان بێتە دیو بەختیاری هەردوو جیهان بن •

بەڵێ ئیسان بۆئەوەی سەرکەوتووی دنیاو دواڕۆژ بێ ، پێویستە

---

(١٤) چونکە ئەو نیازو مەبەستانەی کە بەخێرایی بەزەینو دڵ دا ڕەت دەبن ، مرۆڤیان پێ تاوانبار نابێ هەر چەندە خراپو بەدیش بن •

(١٥) راغب دەڵێ : ( وصار التقوى في تعارف الشرع : حفظ النفس عما يؤثم ) معجم مفردات الفاظ القرآن ص٥٦٨ •

لە کاتی ڕام کردنی نەفسیو جەنگ کردن لەگەڵ لایەنە بەدەکانیدا ئارام گربێت ، وە لەبەرانبەر دوژمنیدا پشوو درێژو خۆڕاگر بێتو هەمیشە ئاگاداری خۆیو ئاینو گەلو وڵاتەکەی بێو لەسەنگەر دابێ ، وە هەردەم لەگەڵ خوا دابێو هەست بەچاودێری‌ی بکاتو پارێزی لێ بکات .

کەواتە ئەم ئایەتەش هەر هەمان ڕاستی دووپات کردەوە کە ئایەتەکانی پێشوو ڕایان گەیاندو پێیان لە سەر داگرت :

لەنێوان یادی خواو پارێزکردن ، وە جیهاد لەڕێی خوادا پەیوەندی‌یەکی زۆر پتەوو بەتین هەیە .

بەڵێ لەڕاستیدا ئیسلام وێڕای دڵۆپە فرمێسکی چاوان دڵۆپە خوێنی هەناوانو ، وێڕای گریانی چاوی نێو مزگەوتو میحراب ، ئێشکە گرتنی چاوی نێو سەنگەرو مەیدانیشی دەوێ !

وە لەنێوان فرمێسکی چاو، خوێنی هەناویش دا پەیوەندی‌یەکی زۆر نیزیک هەیە ، چونکە کەسێك هێندە لەخوا نیزیک بووبێتەوەو هێندە دڵی بەیادی خوا بێدار بووبێتەوە ، سۆزو کەفو کوڵی گەرمی نێو دڵی پڕ لە بەوینی لەڕێی فرمێسکی چاوی‌یەوە بڕێژێ ، ئینسانێکی وا ، چەند دڵۆپە خوێنێکی لەڕێی ئەو خوایەدا کە هێندەی خۆش دەوێ لێ وەچاو نیە .

بەڵێ خوێنەری بەڕێز :

لەڕاستی دا پەیوەندی‌یەکی یەکجار پتەو هەیە ، لەنێوان یادی خواو گریان لەترسی خواو دڵ هوشیاری‌و پارێزکاری لە لایەکەوەو ،

ڕق هەستان و وەدەنگ هاتن لەسەر خواو فیداکاری و جیهاد کردن لەپێناوی بەرز کردنەوەی ئالای بەرنامەکەی دا لە لایەکی دیکەوە • چونکە بەس خواو دڵ بێداری و لەخوا ترسان و خۆشویستنی و پارێزکارییە کە بتوانێ ببێتە پاڵنەرێکی هەمیشەیی و هاندەرێکی ڕاستەقینەی مرۆڤ ، بۆ تێکۆشان و خەباتگێڕی و فیداکاری لەڕێی خوادا ، لەبەر ئەوەی تێکۆشان و خەباتکردن لەڕێی خوادا یەکێ لەسەر بەخت کردنی گیان و سامان و بەرژەوەندییەکان کەوتووە و سەری تیان وەستاوە ، هەڵبەتە مرۆڤیش سەبارەت بە بەختینی ئەمانە ڕژدو بەرچاو تەنگە ، مەگەر ، لەکاتێك دا کە هەست بە چنگ کەوتنی شتێکی بایەخ دار تر بکات لە بەرانبەردا • ( چاك وردبەوە ) •

جا هەر بۆیەش دەبینین لەفەرموودەکانی پێغەمبەریش دا صلی الله علیه وسلم ، وەك ئایەتەکانی قورئانی بەرێز ، مەگەر چۆن دەنا ئەو دووانە ــ واتە لەگەڵ[16] خوا بوون و جیهاد کردن ــ هەر وێکڕا باسکراون ، بۆ نموونە :

یەکەم : [ لا یلج النار رجل بکی من خشیة الله حتی یعود اللبن في الضرع ، ولا یجتمع علی عبد غبار في سبیل الله ودخان جهنم • ] رواه الرمذي عن ابي هریرة وقال حسن صحیح / ریاض الصالحین ص١٧٧ •

واتە :

ەتاکو شیر نەگەڕێتەوە نێو گوان ، بابایەك کە لەترسی خوا

(١٦) بێگومان [ لەگەڵ خوا بوون ] لەزۆر شێوەدا خۆی دەنوێنێ ، وەك : نوێژ یادی خودا ، ڕۆژوو ، گریان لەترسی خوا ، قورئان خوێندن •• هتد •

کریاوه ناچێته ئاگرەوه ، وەتۆزو خۆڵی - جیهادی - ڕێی خواو دووکەڵی دۆزەخ لەسەر بەندەیەک کۆ نابنەوه •

دووەم : [ ليس شيء أحب الى الله تعالى من قطرتين وأثرين ، قطرة دموع من خشية الله ، وقطرة دم تهراق في سبيل الله ، وأما الأثران ، فأثر في سبيل الله ، وأثر في فريضة من فرائض الله تعالى • ] رواه الترمذي عن أمامة الباهلي وقال حسن / رياض الصالحين ص١٧٩ •

واتــه :

هیچ شتێک لـەکن خوای بـەرز لـەدوو دڵۆپەو دوو شوێنەوار خۆشەویست تر نیه ، دڵۆپە فرمێسکێك کە لەترسی خودا ڕێژرابێ ، وە دڵۆپە خوێنێك کە لەڕێ خوادا تکابێ ، بەڵام دوو شوێنە وارەکان ، شوێنــە وارێک لەڕێی - بـەرگری کردن لـە ئاینی - خوا دا ، وە شوێنەواری بەجێ هێنانی فەرمانێك لە فەرمانەکانی خوای بەرز •

سێیەم : [ حرمت النار على عين دمعت - أو بكت - من خشية الله ، وحرمت النار على عين سهرت في سبيل الله • ] رواه احمد والترمذي عن ابي ريحانة • / تفسير ابن كثير ج١ ص٤٤٧ •

واتــه :

ئاگری دۆزەخ لەسەر چاوێک قـەدەغەکراوە کـە لەترسی خـوا فرمێسکی ڕشتبێ - یان گریابێ - ، وە ئاگری دۆزەخ لەسەر چاوێك قەدەغە کراوە ، کە لەڕێی خوادا شەو نخوونی کێشاوە •

---

چوارەم : پیاوێك چۆ لای ( ابو سعيد الخدري )و پێی گوت : ئامۆژگاریم بکەو ڕام سپێرە بەکردنی شتێك کە بەچاکی دەزانی ! ئەویش

پێی گوت : دەربارەی شتێک پرسیارت لێ کردم ، کەمنیش پێش تۆ دەربارەی پرسیارم لەپێغەمبەر صلی اللە علیه وسلم کردوە ــ واتە ئەو چۆنی وەڵام دامەوە منیش ئاوا وەڵامت دەدەمەوە ــ ئنجا پێی گوت :

[ أوصيك بتقوى الله فأنه رأس كل شيء ، وعليك بالجهاد فأنه رهبانية الاسلام ، وعليك بذكر الله وتلاوة القرآن فأنه روحك في السماء وذكرك في الارض • ] رواه احمد • / تفسير ابن كثير ج٤ ص٣١٦،٣١٧ •

واتە .

ڕات دەسپێرم بەپارێزکردن لەخوا ، چونکە پارێز کردن لەسەر هەموو شتێکەوەیە ، وەجیهاد بکە ، چونکە واز لەدنیا هێنان ( رهبانیە )ی ئیسلام جیهادە[17] ، وە یادی خوا بکەو قورئانی بخوێنە ، چونکە یادی خواو قورئان خوێندن لە ئاسمانێ ــ واتە لای خواو فرشتەکان ــ بۆت دەبنە گیان ــ ومایەی ژینێکی مەعنەوی بەلەزەت ــ ، وە لەسەر زەویش دەبنە مایەی ڕێزو پایە بەرزیت •

وەک دیمان پێغەمبەری ڕابەرمان صلی اللە علیه وسلم فرمێسکێک کەلە چاو دەرژێ لە ئەنجامی خۆشەویستیو ترسان سەبارەت بەخواو ، دڵۆپە خوێنێک کە لەجەرگو هەناوان دەتکێ لە ڕێی ئاینی خوادا ، پێکەوە باس دەکاتو ، وێرای گریانی چاوی مرۆڤی نێو مزگەوتو میحراب ، ئێشکە گرتنو شەو نخوونی کێشانی چاوی بابای نێو سەنگەرو مەیدان باس دەکاو ، پارێزکاریو یادی خواو قورئان خوێندن ، لەگەڵ

---

(١٧) واتە : بۆ جیهاد نەبێ بۆ هیچ شتێکی دیکە نابێ دەست بەرداری ژیان بین •

جیهادو فیداكاری جەنگ كـردندا ، بـەراورد دەكاتو بەیەك چاو سەیریان دەكات •

بەڵێ بەڕاستیدا مرۆڤی مسوڵمان بە لەگەڵ خوا بوونو لەسەر خوا كردنەوە ، واتە : بەیادی خوداو جیهاد كردن ، یان بە تەقواو غەزا ، بەهەردووكیان دەتوانێ ڕەزامەندی خـوا وەدەست بێنێو ببێتـە شیاوی چوونە بەهەشتی بەرین •

هەر بۆیەش دەبینین خوای قسەڕاستو دادگەر ، ڕەگەڵ كەوتنی پێڕی شەیتانی لەگەڵ خوا لەیاد چوونەوەدا پێك گرتوەو ، شوێن كەوتنی شەیتانو ڕێچكەكانی ، بە ئەنجامێكی ڕاستەو خۆی خوا لەبیر چوونەوە ، ئەقەڵەم داوە :

[ استحوذ علیهم الشیطان فانساهم ذكر الله ، اولئك حزب الشیطان ألا ان حزب الشیطان هم الخاسرون ] المجادلة ـ ١٩ •

واتـە :

شەیتان بەسەریاندا زاڵ بوەو خستوونیە ژێر ڕكێفی خۆیـەوەو یادی خـوای لەبیر بردوونەوە ، ئەوانە پێڕو دەستەی شەیتانن ئاگادار بن ! پێڕی شەیتانە زیانبارو ماڵ ویران •

ئێستاش كۆتایی ئەم باسە گرنگە بە بەسەرهاتێكی پڕ واتاو دڵتەزێن دێنین كە ( ابن عساكر ) لە سەرگوزشتەی ژیانی ( عبدالله بن المبارك )دا نووسیویەتی :

---

( محمد بن ابراهیم بن ابي سكینه ) دەڵێت :

له کاتێکدا له ساڵی (١٧٠)ی کۆچی لەشاری ( طرطوس )
دەچوومە دەرێو خوا حافیزیم لە عەبدوڵلای کوڕی موبارەك دەکرد
ئەم شیعرانەی بەسەردا خوێندمەوە لە بەدیاری بۆ ( فضیل بن عیاض )
یان بەرم :

یا عـابد الحـرمین لو ابصـرتنا
لعلمت انـك في العبـادة تلعب
من كان یخضب خـده بدموعـه
فنحـورنا بدمائنـا تتخضـب
أو كان یتعب خیلـه في باطـل
فخیـولنا یوم الصـیحة تتعب
ریح العبیر لکم ونحـن عبیرنا
وهـج السنابك والغبـار الأطیب
ولقـد أتانا مـن مقـال نبینـا
قـول صـحیح صـادق لا یکذب
لا یستوي غبـار أهـل الله في
أنف امـریء ودخـان نار تلهب
هــذا کتاب الله ینطـق بیننـا
لیس الشـهید بمیت لا تکـذب

واتـه :
ئەی ئەو خواپەرستەی کە هەمیشە لە کەعبەی پیرۆزو مزگەوتی

(١٨) لە ڕیوایەتێکی دیکەدا دەڵێت (١٧٧)ی کۆچی .

پێغەمبەردا خەریکی خوا پەرستیو یادی خوای !

ئەگەر ئێمەت دیبایە لە مەیدانی جەنگو جیهاد دا ، دەتزانی کە ئەوەی تۆ لەچاو ئی ئێمە وەك یاریو گاڵتە وایــە لــە خوا پەرستیدا ! ئەگەر تۆ ڕوو مەتت بەفرمێسکان ڕەنگ کراوە ، ئێمە سینگمان بەخوێنی لەشمان سوور بووە !

وە ئــەگەر تۆ ئەسپی خۆت لــە بۆشاییدا تاو دەدەیو ماندووی دەکەی ، ئێمــە ئەسپانمان سەر لە سبەینان لە مەیدانی جەنگدا ماندوو دەکەین .

بۆنی ( عەبیر ) ـ کەجۆرە بۆنێکی زۆر خۆشە ـ بۆ ئێوەیەو ، عەبیری ئێمەش بڵێسەی سمی ئەسپانو تۆزو خۆڵی پاکو بۆن خۆشە .

وە ئێمە لە فەرموودەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم پێمان گەیوە ـ بێگومان قسەشی ڕاستەو درۆ ناکات : تۆزی ڕێی جیهاد کەرانی ڕێی خوا ، لەگەڵ دووکەڵی ئاگری دۆزەخدا ، لەنێو لووتی بەندەیەکدا پێکەوە کۆ نابنەوە .

ئەمەش کتێبی خوایەو قسەمان بۆ دەکاتو دەڵێت : شەهیدی ڕێی خوا مردوو یە ، بێگومان قورئانیش درۆ ناکات(٢٠) .

---

(١٩) ( وهج )یش هاتوەو ( رهج )یش ، یەکەمیان یانی بڵێسەو دووەمیش یانی تۆزو خۆڵو غوبار .

(٢٠) منیش ئەو پارچە شیعرەم ئاوا وەرگێڕاوەتە سەر کوردی ، بەڵام زیاتر مەبەستم گەیاندنی واتا بوە نەک وەرگێڕانی وشە بەوشە :

ئــەی خــوا پەرستی مەککەو مەدینە
سەرت بەرزکــەو ئێمــە ببینــە !

ئنجا ( محمد ابن ابراهیم ) دەڵێ : لـە مزگەوتی حەرام گەیشتمە ( فضیل )و نامەکەم دایە ، پاش خوێندنەوەی گریاو گوتی ( عبدالله ) ڕاسـت دەکاتو ئامۆژگاری کـردووم • دوایی گوتی : تۆ فەرموودەی پێغەمبەر دەنووسی ؟! گوتم : بەڵێ ، گوتی : دە ئەم فەرموودەیە بنووسە ، لە جیاتی ئەوەی کە نامەی ( عبدالله )ت بۆ هێناوم وە ئەم فەرموودەیەی بەسەردا خوێندمەوە :

عن أبي هريرة ان رجلا قال يا رسول الله علمني عملا انال به ثواب المجاهدين في سبيل الله ، فقال : [ هل تستطيع ان تصلي فلا تفتر وتصوم فلا تفطر ؟! فقال : يا رسول الله انا اضعف من ان استطيع ذلك ، ثم قال النبي صلى الله عليه وسلم : فوالذي نفسي بيده لو طوقت ذلك ما بلغت

---

هـــەنا بزانیو دڵنیـــابی تـــەواو
کـەتۆ بەو کارەت خـەریکی کـەمەی
کـــە تۆ ڕوومەتت تـــەڕی فرمێسکە
دەنگت بـەس دەنگی گریەو هەنیسکە
ئێمـــە سینەمان بەخـــوێن شـەلاڵە
نابێ ئاوو خوێن وەک یەک سەیرکەی
کـە ئەسپی ئێوە ماندوونە بێ هــۆ
ئەسپی مە سبەینان ماندوونو مجـرۆ
ئێوە بەعەبیر خـۆ بۆن خۆش دەکەن
عەتری مە تۆزی سمی ئەسپەو بڵێسەی
لەپێغـــەمبەرمان وەهـــا بیســـتراوە
بێگومان قسەشی ڕاســـتو تـــەواوە
تۆزی ڕێی خـــواو دووکـــەڵی دۆزەخ
پێکەوە ناچنـــە نێو لووتی بـــەندەی
ئەمـــەش کتێبی خـــوایەو دەفەرمێ
شـــەهید نامرێو ڕاستیشە قســـەی

للمجاهدين في سبيل الله ••• [ تفسير ابن كثير • ج١ ص٤٤٧ •

پیاوێك گوتی : ئەی پێغەمبەری خـوا کردەوەیەکم فێر بکە کـە بەهۆی ویەوە پاداشتی جیهادکەرانی ڕێی خوا وەربگرم ، پێغەمبـەر گوتی : ئایا دەتوانی بێ پسانەوە نوێژان بکەیو بێ بواردن هەموو ڕۆژان بەڕۆژوو بی ؟!

گوتی : ئەی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم من لەوە بێ هێز ترم ئەوەم بۆ بکرێ ، دوایی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم گوتی : دە سوێند بەو زاتەی نەفسمی بەدەستە ، ئەگەر ئەوەشت لە وزەدا هەبێ ، ناتوانی بگەیە ڕیزی تێکۆشەرانی ڕێی خوا •

هەڵبەتە وەك دیتمان عەبدوڵلای کوڕی موبارەك زۆری لەنرخی یادی خواو گریانو نوێژ داشکاند ، بەڵام وادیارە ئەودەمی بارو دۆخی وڵات ناسكو نائاسایی بووەو مسوڵمانان لە مەترسی دابوون ، بێگومان لە کاتێکیش‌دا ئیسلام پەکی لەسەر خوێنی شەهیدانی نێو جەرگەی مەیدانی جەنگ بکەوێ ، بەفرمێسکی خواپەرستو نوێژکەرانی نێو مزگەوت قایل نابێو ئیسلام هەرشتەی لە کاتی خۆی دا دەوێ •• !!

**خوێنەری خۆشەویست !**

ئـەوە کورتەیەك بوو دەربارەی پـەیوەندی نێوان یادی خـواو تێکۆشان لەڕێی خوادا •

وەك دیتمان جیهاد کردنو یادی خوا نەك هەر تێك ناگیرێنو دژ ناوەستن ، وەك سادەو لەئیسلام بێ ئاگایان گومان دەبەن ـ بەڵکو یەکتریش تەواو دەکەنو هەر کامێکیان پێویستی بەوی دیکە هەیەو پەکی لەسەر دەکەوێ •

چونکــه :

له ڕاستی‌دا ته‌نیا مرۆڤێك ده‌توانێ له‌پێناوی خوادا چاو پۆشی لــه هه‌موو شتێك بكاو ده‌ست به‌رداری گیان‌و سامانی بێ ، كه هێنده بڕوا دارو مسولمان بێت هه‌میشه دلی به‌یادی خوا گه‌شاوه بێ‌و زمانی پێی پاراو بێ .

دیسان ته‌نیا جیهاد كه‌رێكیش ده‌توانێ خۆی بۆ خوا یه‌كلا بكاته‌وه‌و بێجگه له خزمه‌ت كردن به ئیسلام‌و ڕازی كردنی خوا هیچ شتێكی دیكه‌ی مه‌به‌ست نه‌بێ ، كه هێنده په‌یوه‌ندی گیانی له‌گه‌ڵ خوادا پته‌وو به‌تین بێ ، ده‌نا ئه‌گه‌ر وانه‌بێ ڕه‌نگه‌و زۆریش نیزیكه ، نه‌فس‌و شه‌یتان ، ئیسلام‌و خوای له‌بیر به‌رنه‌وه‌و جیهاد كردنه‌كه‌ی لێ بكه‌نه خۆ ماندوو كردنێكی بێ سوود به‌هۆی جوولاندن‌و بزاوتنی ده‌ماری : ڕیا بازی‌و خۆ ده‌رخستن‌و پله‌و پایه خوازی‌و خۆ ڕانواندن‌و خۆ په‌رستی‌و دنیا ویستی‌یه‌وه .

ئێنجا به‌س جۆره یاد كردن‌و له‌گه‌ڵ خوادا بوونێكیش به شتێكی ڕه‌سه‌ن‌و په‌سند داده‌نرێ‌و خواش پێی قایل ده‌بێ ، كــه خاوه‌نه‌كه‌ی ئاماده‌بێ ، به‌پێناوی ئه‌و خوایه‌دا كه ئه‌و لافی **خۆشویستن‌و لێ ترسانی** لێ ده‌دات ، جیهاد بكاو له‌ڕێی به‌رزكردنه‌وه‌ی ئایین‌و به‌رنامه‌كه‌ی‌دا ده‌ست به‌رداری گیان‌و سامانی بێت .

جا خوایه :

بمانگێڕی له‌وانــه‌ی خاوه‌نی یاد كــردنێكی ڕه‌سه‌ن‌و تێكۆشانێكی ڕاسته‌قینه‌ن . ئامین .

# بەشی نۆیەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو بیر چەسپاندان

یادی خوداو لەگەڵ خوادا بوون ڕۆڵێکی یەکجار سەرەکیو گرنگ دەگێڕێ لە گەشە پێدانو فراژوو کردنی خەسڵەتی چەسپاندنو کۆ کردنەوەی بیر ( ترکیز وحصر الذهن )دا ، پێشەکی با بزانین گرنگیو کاریگەری ئەم خەسڵەتە چی‌یە لەڕوانگەی زاناو پسپۆڕانەوە دوایی ، دینەوە سەر باسی چۆنیەتی پەیوەندی یادی خوا بە خەسڵەتی بیر چەسپاندنەوە •

دکتۆر ( احمد عزت راجح ) دەربارەی نەخۆشی زەین بڵاویو بیر پەرت بوون کە پێچەوانەی بیر چەسپاندنە دەڵێ : [ پێویست بە ڕوون کردنەوە ناکات ، کە زەین بڵاویو بیر پەرت بوون ئەگەر بووبە خوویەکی چارەسەر نەکراو ، چەند شوێنەوارو ئەنجامی بەدو دڵتەزێنی دەبن ، وە زۆر لە خوێندکاران دەڵێن ئەو نەخۆشی‌یە هۆیەکی سەرەکیو بنەڕەتی بووە لەدواکەوتنو کەوتنی جار لەدوای جاریان • ئەمە بێجگە لەوەی کەئەم حووە دەبێتە هۆی هەست کردن بە ناتەواویو هەست کردن بە دەستەوسانی لە ئاقار خۆ چارەسەرکردندا ، بگرە تەنانەت ڕق لە خۆ هەستانیش • ][1]

---

(١) ( اصول علم النفس ) احمد عزت راجح استاذ علم النفس بجامعة الاسكندرية ٠ / ص١٨٤ ط٠ مزيدة منقحة ٠

ئنجا ( ولیم مولتون ) قسەیەکی زۆر بەنرخی مامۆستای دەروونزانی نوێ ( ولیم جیمز ) باس دەکات کە گوتوویەتی :

[ جیاوازی نێوان بلیمەتە هەلکەوتووەکانو خەلکی ئاسایی ناگەڕێتەوە بۆ خەسلەتێکی خۆڕسکی خوایی ، بەلکو جیاوازی بنچینەیی نێوان بلیمەتانو خەلکی دیکە ئەوەیە کە ئەو بابەتو ئامانجانەی ئەوان بیریان لێ دەکەنەوەو ئیرادەی خۆیانیان ئاراستە دەکەن جوودان لە ئی خەلکی بەپشتەوە نرە • ](٢)

ئێستا کە زانیمان خەسلەتی بیر کۆکردنەوەو چەسپاندنی لەسەر یەک بابەتو مەبەست چەند گرنگو کاریگەرە لە ژیانی مرۆڤ دا ، با بزانین شێوازو چۆنیەتی وەدەست هێنانی ئەم خەسلەتە چییەو چۆن دەتوانین ئەم خەسلەتە لە خۆماندا گەشە پێ بدەینو فراژووی بکەین :

دکتۆر ( احمد عزت راجح ) لەم بارەوە دەلێ :

[ ئەوانەی کە سەبارەت بە کەم توانایی بیر چەسپاندنو وریایی سکالا دەکەن ـ جاکەیفێ خۆیەتی قوتابی بن یان نا ـ گیرو گرفتی وان بێ دەسەلاتی‌یەکی یەکجاری نیە سەبارەت بە بیر کۆکردنەوە ، بەلکو گیرو گرفتی وان ، بریتیە لە بیر ڕۆیشتنیانو دالغە لێدانیان بە چەند شتێکەوە کە لەو شتەی بیری لێ دەکەنەوەو دەیانەوێ لەزەینی خۆیان دا بی چەسپێنن ، خۆشەویستت رن ، وەهیچ شتێك نیە یارمەتی زەین چەسپاندنو بیر کۆ کردنەوە بدات سەبارەت بە بابەتێکی دیاری کراو ، وەکو هەبوونی مەیلو ئارەزوو ر بایەخ پێدانو خۆشەویستی لەدلّدا ،

---

(٢) ( روح الصلاة في الاسلام ) عفیف عبدالفتاح طبارة ص٣١ ط١١ ٠

ئنجا ( ولیم مولتون ) قسەیەکی زۆر بەنرخی مامۆستای دەروونزانی نوێ ( ولیم جیمز ) باس دەکات کە گوتوویەتی :

[ جیاوازی نێوان بلیمەتە هەلکەوتوەکانو خەلکی ئاسایی ناگەڕێتەوە بۆ خەسلەتێکی خۆڕسکی خوایی ، بەلکو جیاوازی بنچینەیی نێوان بلیمەتانو خەلکی دیکە ئەوەیە کە ئەو بابەتو ئامانجانەی ئەوان بیریان لێ دەکەنەوەو ئیرادەی خۆیانیان ئاراستە دەکەن جوودان لە ئی خەلکی بەپشتەوە نرە • ](٢)

ئیستا کە زانیمان خەسلەتی بیر کۆکردنەوەو چەسپاندنی لەسەر یەک بابەتو مەبەست چەند گرنگو کاریگەرە لە ژیانی مرۆڤ دا ، با بزانین شێوازو چۆنیەتی وەدەست هێنانی ئەم خەسلەتە چیەو چۆن دەتوانین ئەم خەسلەتە لە خۆماندا گەشە پێ بدەینو فراژووی بکەین :

دکتۆر ( احمد عزت راجح ) لەم بارەوە دەلێ :

[ ئەوانەی کە سەبارەت بە کەم توانایی بیر چەسپاندنو وریایی سکالا دەکەن ــ جاکەیفێ خۆیەتی قوتابی بن یان نا ــ گیرو گرفتی وان بێ دەسەلاتی‌یەکی یەکجاری نیە سەبارەت بە بیر کۆکردنەوە ، بەلکو گیرو گرفتی وان ، بریتیە لە بیر ڕۆیشتنیانو دالغە لێدانیان بە چەند ستێکەوە کە لەو شتەی بیری لێ دەکەنەوەو دەیانەوێ لەزەینی خۆیان دا بی چەسپێنن ، خۆشەویست ترن ، وەهیچ شتێك نیە یارمەتی زەین چەسپاندنو بیر کۆ کردنەوە بدات سەبارەت بە بابەتێکی دیاری کراو ، وەکو هەبوونی مەیلو ئارەزوو ر بایەخ پێدانو خۆشەویستی لەدلدا ،

(٢) ( روح الصلاة في الاسلام ) عفيف عبدالفتاح طبارة ص٣١ ط١١ •

سەبارەت بەو بابەتە دیاری کراوە . ](٣)

کەواتە :

خۆشویستنی شتێك و بایەخ و گرنگی پێدانی نە لایەن مرۆڤەوە یارمەتی دەدات کە بتوانێ بیری خۆی لەسەر بچەسپێنێ هەڵبەتە کاتێك ئەو خەسڵەتەش لەمرۆڤدا گەشەی کرد سەبارەت بەشتێکی دیاری کراو ، دوایی لەمرۆڤدا دەبێتە سیفەتێکی بنچینەیی لەهەموو بوارەکانی ژیانیداو سەبارەت بەهەر شتێك کەبیەوێ لێی ورد بێتەوەو بیری لێ بکاتەوە .

( ولیم مولتون )یش سەبارەت بە شێوازی دەستگیر کردنی ئەم خەسڵەتە دەڵێ :

[ وە پەیداکردنی توانای بیر چەسپاندن حەوجێی بە ڕاهێنان و پلە پلەیی هەیە ، خۆ ڕاهێنانیش پێویستی بە خۆڕاگری و پشوو درێژی هەیە ، چونکە قوتار بوون لەزەین بڵاوییەوە بەرەو بیر کۆکردنەوەو زەین چەسپاندن ، بەرهەمی هەوڵ و ڕەنج کێشانێکی زۆرو بەردەوامە ، جا ئەگەر بتوانی زەینت بگێڕیەوە سەر ئەو بابەتەی بڕیاری چارەسەر کردنیت داوە ، جار لە دوای جار بەنجا کەرەت و سەد کەرەت ، دەبینی ئەو دالغەو خەیاڵانەی لە مێشکتدا چەنگە برچەیان بوو دەهاتن و دەچوون ، زۆر ناخایەنێ ، شوێنی خۆیان چۆڵ دەکەن بۆ ئەو مەبەست و بابەتەی کە هەڵت بژاردوەو بڕیارت لەسەرداوەو مشوورت لێ خواردوە، ئنجا دوایی دەبینی وات لێ هاتوە ، هەر کاتێکی بتەوێ بیرت بچەسپێنی

---

(٣) ( اصول علم النفس ) ص١٨٣ .

بەگوێرەی ویستی خۆت دەتوانی ٠ ][٤]

جا ئێستا زۆر بەڕاشکاوی دەتوانین پەیوەندی نێوان یادی خواو بیر چەسپاندن ( ترکیز الذهن ) بخەینە ڕوو :

لەو قسانە:ا کە لەپسپۆڕو شارەزایانی دەروونناس ، وەرمان گرتن دەرکەوت ، کە بۆ هێنانەدیو گەشەپێدانی سیفەتی بیر چەسپاندن دوو هۆی سەرەکی پێویستن :

یەکەم : هەبوونی مەیلو ئارەزوو و هەست کردن بە خۆشەویستیو گرنگی پێدان سەبارەت بەو شتەی بابەتی بیر لەسەر خڕ کردنەوەو زەین لەسەر چەسپاندنە ٠

دووەم : خۆ ڕاهێنانو زۆر لەخۆ کردنو بەردەوامی چەند جارێك گێڕانەوەی بیر بۆسەر مەبەستو بابەت ( موضوع )ی دیاری کراو ٠

هەڵبەتە شتێکی ڕوونو ئاشکراشە کە هەرکام لەم دوو هۆیە لەیاد کردنی خوادا هەیە ، چونکە وەك لەلاپەڕەکانی پێشوودا ڕوونمان کردەوە ، یادی خوا ئەنجامی خۆشەویستی زۆرو بێ سنووری خوایە لەدڵی بابای خوا یادکەر دا ، دیسان یەکێك لە مەرجو نیشانە بنەڕەتی یەکانی یادی خوا بریتیە لە دووبارە کردنەوەو ، بەردەوامی لەسەر بەدڵدا هێنانو گۆ کردنی چەند واتاو مەبەستو وشەیەکی دیاری کراو ، بۆ نموونە :

( سبحان الله ، الحمد لله ، الله اکبر ، لا اله الا الله ، استغفر الله ، لا حول ولا قوة الا بالله ٠ )

کەواتە :

---

(٤) ( روح الصلاة ) ص٣٢ ط١١ ٠

ئێستا دەتوانین بڵێین :

بەڵێ یادی خودا گەورە ترین‌و بنەڕەتی ترین هـۆی هێنانەدی‌و ئەشە پێدان‌و فرازوو بوونی خەسڵەتی بیر چەسپاندنە لەژیانی ئینسان‌دا •

جـا هـەرچەندە ئامانجی مرۆڤی مسوڵمان لـە خوا یاد کردنی‌دا دەستگیر کردنی ئەم خەسڵەتە نیە ؛ بەڵکو ئامانجی بەجێ‌هێنانی ئەرکێکی ئیسلامی‌و ڕازی کردنی خواو پتەو بوونی بڕواو وەدوا کەوتنی پێغەمبەرو ساف بوونەوەی دڵو دەروونیەتی ، بەڵام وێڕای ئەمانەش لەئەنجامی خوا یادکردن‌دا ئەم دیاری‌یە بەنرخەشی دەستگیر دەبێ •

# بەشی دەیەم

## پەیوەندی نێوان یادی خواو دروست بوونی کەسایەتی

شتێکی بەرچاوو جەرپێنراوەو دەروونناسو کۆمەڵناسانی کارامەو شارەزاش دایان پێدا هێناوە ، کە ئینسان بەس کاتێك ئارامیو دڵنیایی لەدەروونیدا دەچەسپێو خێر لەژیانی خۆی دەبینێ ، کە ڕووی دڵی بکاتە یەك ئامانجی دیاری کراوو ، خۆی بۆ یەك شتو یەك تاقە ئاواتو مەبەست یەکلا بکاتەوەو ، هەموو هێزە دەروونی ( معنوي )و ڕواڵەتی ( مادي )یەکانی ئاراستەی وی بکاتو بە هەموو گیانو بوون ( وجود )ی خۆی پێوە خەریك بکات .

ئنجا پسپۆڕو شارەزایان دەڵێن : ئەو ئامانجو ئاواتو مەبەستەش تەنیا دەبێ شتێکی نا مادديو مەعنەوی بێت ، چونکە مرۆڤ بەس جەستەو دیوە ڕواڵەتەکەی بە شتە ماددییەکان قەناعەتو تەسەللای دێ ، گیانو دیوە دەروونییەکەی هیچ کاتێك بەماددەو دیاردەکانی فەرامۆشی نایەتو ئاسوودە نابێ .

جا بێگومان تەنیا کاتێکیش مرۆڤ دەبێتە خاوەنی کەسایەتی ( شخصية )یەکی ساغو سەلیمو تێرو تەواو ، کە هەموو وزەو تینو چالاکییەکی ڕوو پێ بکاتە ئامانجێكو ، بارو دۆخێکی وای بۆ بڕەخسێ

که مەودای تیر کردنو ڕازی کردنی هەموو پێداویستیو داخوازییەکانیو جەستەیییەکانی بدات ، بەبێ لێ بڕینی لایەنێک بۆ لایەنێکی دی یان زیادەڕۆیی لە لایەنێکدا لەسەر حیسابی لایەنێکی دیکە •

جا بەبڕوای ئێمەی مسوڵمان تەنیا ئیسلام دەتوانێ ئەو جۆرە کەسایەتییە بێرو تەواوە بۆ مرۆڤ بێنێتە دیو ، لەژێر سێبەری غەیری ئیسلامدا شتی وا مەحاڵو چاوەڕوان نەکراوە •

چونکە ئیسلام بە هۆی یادی خواوە ـ کە درووشمی مسوڵمانانە ـ دڵی مرۆڤ پڕ دەکات لەڕێزو خۆشەویستیو ئەوینو ، وای لێ دەکات کە هەموو هەوڵو تەقەللاو چالاکی ژیانی بریتی بێ لە گەشتێکی هوشیارانەی پڕ سۆز بەرەو ئامانجو ئاواتێکی ، موتڵەقو بێ سنوورو نیزیکو لەهەمان کاتدا زۆر دوور ! کە بریتیە لە : ڕازی کردنی خوا ( رضوان الله ) •

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست !

تەنیا بەڕێی پەیوەندی هەبوون لەگەڵ خواو یاد کردنی خواوە ، مرۆڤ دەتوانێ لەپارایی‌و بەرهەڵدایی‌و هەڵوەدایی لەخۆجیایی‌و زەین بڵاوی قوتاری بێو ، بەهۆی هەوڵدانو کەوتەڕێ بەرەو یەک تاقە ئامانجی هەرە بەرزو پیرۆز کەسایەتییەکی مرۆڤانەی ڕاستەقینەی ساغو سەلیمو تەواو وەدەست بێنێ •

بەڵام لەبەر ئەوەی هەندێک لەزانایانی پسپۆڕ لەدەروونزانیدا لەم بارەوە قسەی بەرخیان هەن ، بۆ چاکتر ڕوون بوونەوەی مەبەستو زیاتر

دڵنیا کردنی[1] خوێنەرو بەهێزتر کردنی قسەکانم چەپکێك لە قسەکانیان لێ دەخوازمەوە .

**ئەریک فرۆم :**

ئـەم زانایە سەبارەت بـە مەسەلەی گرنگیو پێویستی هـەبوونی ئامانجێکی مەعنەوی لەژیانی مرۆڤدا دەڵێت :

[ مرۆڤ ناتوانێ لـەحاڵەتێکی وەستاو ( سکون )دا ژیان بەسـەر بەرێ ، چونکە پاڵنەرە دەروونی‌یەکانی هانی دەدەن ، کە بەرەو پەیوەندی بەستنو هاوسـەنگی‌یـەکی نوێ بڕوا لـەجیـاتی ئـەو هاوسـەنگی‌یە گیانداری‌یەی کە ـ بە هەڵبڕدن لەقۆناغی منداڵی ـ لەدەستی چووە .

مرۆڤ دوای وەدەست هێنـانی پێداویستی‌یـە جەسـتەیی‌و گیانداری‌یەکانی ، هەوڵی دابین کـردنی داخـوازی‌یە ئینسانی‌یـەکانی دەدات ، لەکاتێکدا کە جەستەی پێی دەڵێ چ بخـواتو چ نەخوات ، ویژدانیو گیانی فەرمانی پێ دەکات ، کە چ جۆرە مەبەستو ئامانجێك پەروەردە بکاتو چ جۆرە ئارەزووو داخوازی‌یەك پێشێل کاتو پشت گوێ بخات .

لەڕاستی‌دا ئەو وزەو تینە گەورەیەی کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی نەخۆشی دەروونی‌و ، دیسـان ئـەو وزەو تینەی کـە لەپشت ئایین‌و هونەرەوەیە ، ناتوانین بە بەرهەمی کپ کرانی داخوازی‌یە جەستەیی‌یەکانی

---

(١) چونکە خوێندەوارانی کوردو غەیری کوردیش پتر باوەڕیان بەقسەی زانا بیانی‌یەکان هەیە لـەئی خۆماڵی ، هەڵبەتە لەمەشدا هەقیش هەیەو ناهەقیش هەیە ، ئەوەی لەیەکیشیان جیا وەکات ژیرە .

دابنێین ــ وەک، فرۆید دەڵێ ــ بەڵکو هەوڵدانو کۆششێکی سروشتیو ڕەسەنە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیاری : هۆی پەیدا بوونی مرۆف . ]

ئنجا دەڵێت : [ لەڕاستیدا دەروون نەخۆش کەسێکە کە نەیتوانیوە بەرەو لایەک ( جهة )ی دیاری کراو جۆرە پەیوەندییەک پەیدابکات ، بابایەکی وا بەگیراو ( مسجون )یکی مەعنەوی دادەنرێ هەرچەندە بەڕواڵەت ئازادو سەربەست بێو لەو دیوی پەنجەرەی گرتووخانەوە دیار نەبێ . ](٢)

ئنجا سەبارەت بەو لایەن ( جهة )ە مەعنەوییەی کەپێویستە مرۆف رووی تێ بکات ، کەبیەوێ کەسایەتییەکی ساغو سەلیم وەدەست بێنێ ، دەڵێت :

[ جیاوازی سەرەکی نێوان ئاینە یەکتا پەرستەکان ( أديان التوحيد )و هاوتا پەرستی ( شرك )و بت پەرستی ، ئەوە نیە کەلە هاوتا پەرستیو بت پەرستیدا ژمارەی پەرستراوەکان زۆرە ، بەڵکو لەوەدایە کە هاوبەش پەیداکردنو بت پەرسی دەبێتە هۆی [ لە خۆ بێگانە بوون ]ی مرۆف .

چونکە مرۆف تواناو تینی ژیریو هونەری خۆی لەدروست کردنو تراشینی بتێکدا بەکار دێنێ ، دوایی هەر هەمان بتی ساختەی دەستی خۆی دەپەرستێ کە بێجگە لە بەرهەمی هەوڵو ماندوو بوونی خۆی چیدی نیە !

وزەی مرۆف لەپێناوی ( بت )دا بەکار هێنراوە ، بەڵام دوایی هەر

---

(٢) ( جامعەسالم ) اريك فروم ص٤٧ ، ٤٨ ، ٤٩ .

ئەو شتە کراوە بەبتو پەرستراو .

واتە ، ئەو بتە دواتر بە بەرهەمی کاری مرۆڤ دانانرێ ، بەڵکو بەشتێکی جوێ لە مرۆڤو باڵاتر لە مرۆڤ دادەنرێو ، لەبەرانبەری ڕادەوەستێو خۆی تەسلیم دەکاو دەیپەرستێ .

بەڵام بەپێچەوانەوە بنچینەی ئاینە یەکتاییەکان بریتیە لە بڕوا بوون بە تەواوی و بەڕێزیو بێ سنووری مرۆڤ . لە بت پەرستیدا مرۆڤ کڕنووش بۆ بەشێك لە خەسڵەتەکانی خۆی دەباتو خۆی بەسەر چاوەی ژیری و زانیاری و خۆشەویستی نازانێ ، مرۆڤ خۆی لەبەرچاو دەبێتە شتێکی بێ نرخو دراوسێیەکانیشی بە هەمان شێوە ، چونکە پەرستراوەکەی ( شت )ە . ](٣)

ئنجا دێتە سەر باسی جۆرێکی دیکەی ئەو بت پەرستیو شت پەرستی یەی ، کە لەئاکامی لەیەکتاپەرستی ( توحید ) دوور کەوتنەوەوە لەمرۆڤدا دێتە دی ، کە بریتیە لە مرۆڤ پەرستیو ( طاغوت ) پەرستیو دەڵێ :

[ هەمان دیاردە ـ دیاردەی لەخۆ بێگانە بوونو خۆ لەکن کچکە بوونەوە ـ لەپەرستنی ڕابەرێکی سیاسی و سەرۆکێکی وڵاتیشدا دەبینرێ ، ئەم دووانە ـ ڕابەری سیاسیو سەرۆکی دەوڵەت ـ بەپێی ویستو هەڵبژاردنی مرۆڤ دێنە کایە ، بەڵام دوایی دەبنە چەند بتێك کە خەڵکی وزەو تواناى خۆیانیان لەگرەو دەنێنو ، بۆ دووبارە پەیدا کردنەوەی بوونو وزەو توانا ـ کەسایەتی پەیدا کردن ـ پەنا دەبەنە بەر خۆ

---

(٣) سەرچاوەی پێشوو ص١٤٨ ، ١٤٩ .

بەقوربان کردنیانو پەرستنیان • ]

دوایی دێنە سەر باسی جۆرێکی دیکەی زۆر باو لە بت پەرستی کە بریتیە لە پەرستنی هەواو ئارەزووەکانی نەفس واتە : ( عبادة النفس ) خۆ پەرستیو دەڵێت :

[ بت پەرستی بەس لە حاڵێکدا نایەتە دی کە مرۆڤ شتێکی جودا لە خۆی بپەرستێ ، بەڵکو لە کاتێکدا مرۆڤ دووچاری هەستو نەستو بیر کردنەوەی هەڵەو نا ماقووڵ دەبێ تووشی خۆپەرستیش دەبێ ، ئـەو کەسەی کە پاڵنەرو هاندەری ژیانی بەس بریتی بێ لەهەواو ئارەزووو گەیشتن بەپایەو پلەو دەسەڵات ، پەی بەهێزە بێ سنوورەکانی خـۆی نەبردوە ، چونکە بۆتە کۆیلەی یەکێک لەئارەزوو و داخوازییەکانی خۆی ، ئەو کەسەی کە دوو چاری پارە کۆکردنەوەو ماڵ وەسەرێک نان بوە ، بۆتە کۆیلەی پارە • ](٤)

**دایل کارنیجی :**

ئەم زانا دەروونناسو کۆمەڵناسە بەناو بانگە سەبارەت بە پەیوەندی نێوان جۆری بیرو باوەڕو بیر کردنەوەو کەسایەتی مرۆڤ دەڵێت :

[ جۆری بیر کردنەوەمانە کە کەسایەتی ئێمە دروست دەکات ، وەرپێرەو ( اتجـاه )ی بیرو بۆ چوونمانە سەرەکی ترین هـۆی دیاری کردنی چارەنووسمانە ، بۆیە ( ئیمرسون ) گوتوویەتی : [ هەواڵم پێبدە کابرا چی لەبیرو هۆشدا دێو دەچێ ، هەواڵت دەدەمێ چ کەسە • ]

---

(٤) سەرچاوەی پێشوو ص١٥٠ ، ١٥١ •

وەبۆیە ئیمپراطۆری ڕۆمی ( مارکوس ئورلیوس ) گوتوویەتی :
[ ژیانمان دروست کراوی بیرو تێڕوانینمانە • ]

بەڵێ ئەگەر بیری بەختیارانەمان بەدڵدا هاتن ، بەختیار دەبین ، وەئەگەر بیرو بۆچوونی بەد بەختانەوە ڕەش بینانە بەسەر دڵو مێشکماندا زاڵا بوون ، بەد بەختو چارە ڕەش دەبین ، ئەگەر بیرو خەیاڵی ڕسنۆکانەمان لە دڵدا چەسپین ، ترسنۆک دەبینو ، ئەگەر بیرو خەیاڵی نەخۆشیو دەردە داریمان بەسەر دڵدا زاڵ بوو حەتمەن نەخۆش دەبین ، وە هەروەها • ](٥)

ئنجا دایل کارنیجی [ سەر گوزشتەی ئەو گەنجەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە نەخۆشی زەردو لاوازی کردبوو ، ویستی لەنیشتمانەکەی خۆی کۆچ بکاو بچێتە گەشتو گەڕان ، بەنیازی چاك بوونەوەو وەدەست هێنانی لەش ساغیو تەندرووستی •

بەڵام بابی سروشتی نەخۆشییەکەی دەزانی ، دەیزانی کە بەهۆی بیرو بۆچوونو تێڕوانینی هەڵەو ناتەواوەوە وای بەسەر هاتوە ، بۆیە دوای سەفەر کردنی نامەیەکی ئاوای بۆ نووسی :

ڕۆڵە ! ئێستا تۆ (١٥٠٠) میل لە ماڵێ وەدوور کەوتووی بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ هەست بە جیاوازی حاڵەتی ئێرەو ئەوێت ناکەی ، ئایا وانیە ؟! با ، چونکە تۆ بەدرێژایی ئەو ڕێیەی کەبڕیوتە ، ئەو تافەشتەی کە چاوگی دەردو نەخۆشی تۆیە لەگەڵ خۆتت بردوە ، کە بریتیە لە نەفست ، هیچ دەردێکی جەستەییو بیریت نیە ، بەڵکو ئەوشتەی

(٥) ( جدد حیاتك ) محمد الغزالي ص٩٦ •

تۆی تووشی سەرگەردانیو دەردەداری کردوە ئەو بیرو بۆ چوونو تێڕوانینە خوارو خێچەیە کەپێی ڕوو بەڕووی زیان دەبێ ، مرۆڤیش چۆن بیر بکاتەوە ئاوا دەبێ ، جاهەر کاتێک هەستت بەم ڕاستی یەکرد ، کوڕە شیرینەکەم ! وەرەوە ماڵێو دەبینی دەردت لێ نەماوە .

گەنجەکە دەڵێ ئەم نامەیە زۆر پەستی کردم ، بە ئەندازەیەک کە بڕیارم دا هەرگیز نەچمەوە نیشتمان ، دەڵێت : بەڵام لە کاتێکدا شەقامی یەکێک لەشارەکانم دەپێوا ، کلێسایەکم لەسەر ڕێیە دی نوێژی تێدا دەکرا ، جا لەبەرئەوەی ئامانجێکی دیاری کراوم نەبوو خۆم پێداکرد ، تا بزانم چ باسە !

کە چوومە ژوورێ ئامۆژگاری یەکی ئاینی باس دەکرا ، بەناوی [ ئەو کەسەی بەسەر نەفسی دا زاڵ دەبێ لەوکەسە گەورەترە کە شارێک دەگرێ ] :

لەو دەمەیدا وەکو بەشتەماڵێك بەسەر ئاوێنەی تۆزو ژەنگ لێنیشتووی مێشکم دابێ ، ئەو هەڵچوونو شێوانە دەروونی یەم نەماو ، توانیم بەشێوەیەکی ڕاست بیر بکەمەوەو چی یەت ( ماهیة )ی نەفسی خۆم ببینم ، بەڵێ دیتم خەریکمو دەمەوێ دنیاو ئەوەی تێیایە بیگۆڕم ، بەڵام دوای ئەو ئاڵو گۆڕەی بەسەرمدا هاتزانیم کە تاقە شتێک پێویستی بەگۆڕان بێ ، بریتیە لە جۆری بیر کردنەوەو تێوەڕامانم ، گۆڕینی نەفسم . ][٦]

---

(٦) سەرچاوەی پێشوو ص٩٧ ، ٩٨ . وە ( بهترین راه غلبه بر نگرانیهاو نا اُمیدیها ) ص١٨٨ .

خوێنەری سەنگین !

لەمەوە کەرابرد ڕوون بۆوە کـە لـەنێوان جۆری بیرکردنەوەو شێوەی تێڕوانینو ئـەو شتەی مرۆڤ دەیکاتە ئامانجی ژیانیو دروست بوونی کەسایەتی مرۆڤ دا ، پەیوەندییەکی بەتینو ڕاستەو خۆ هەیە ، دەجا هەر ئێستاش دەتوانین زۆر بـەسێتایی هەست بە پەیوەندی نێوان یادی خواو دروست بوونی کەسایەتییەکی تێرو تەواو بکەین :

لە ئەنجامی ئەوەدا کە مرۆڤ بەهۆی یادی خواوە پەیوەندی لەگەڵ سەرچاوەی بوونی ، پەروەردگاری بەخشندە ، پەیدادەکاتو پەیوەندی بوونیش لەگەڵ خوادا ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەسەنو تەواو بێ ، سەرلەبەری ژیانی مرۆڤ دادەگرێو هیـچ بۆشاییو کـونو کـەلێنێک لەسروشتی مرۆڤو واقیعی ژیان نایەڵێتەوە ، بەڵێ لەئەنجامی ئەوەدا مرۆڤ هەموو ژیانی پڕپڕ دەبێت لە هاوسەنگیو بەختیاریو ئاسوودەییو ڕەزامەندی ، چونکـە ئـەو دڵو گیانو بیرو هۆشەی کـە گوتمان بەبێ پەیوەندی هەبوونێکی مەعنەوی سنیوور نابێو دڵنیا نابێ ، لە ئاوا حاڵێکدا بەهۆی ڕاستترینو سروشتی ترین پەیوەندی - کەپەیوەندی هەبوونە لەگەڵ خوادا - ڕوو دەکاتە یەک ئامانجو مەبەستی هـەرە بەرزو سروشتیو واقیعی ، کـەمرۆڤ بەبێ ڕوو کردنـە وی نەکەسایەتییەکی سـاغو سەلیمی بۆ دروست دەبێ ، وەنە خێرو خۆشیانیش لەخۆی دەبینێو دڵی دادەمرکێ .

بەڵێ ، یادی خـوا مرۆڤ بەرەو گەورەترین ڕاستیو بەرزترین ئامانج جڵەوکێش دەکـاتو وای لێدەکـات کـەدڵی تەنیـا جێگـەی خۆشەویستیو ترسو بەندایەتی بۆیەک زات تێدا بێتەوەو نەبێتە بتخانە ،

وە وای لێ دەکات کە بیرو هۆشی، جێگەی ناقە یەک ڕاستی تێدابێتەوەو پڕ نەبێ لەئەفسانە •

ئنجا خوێنەری خۆشەویست :

یادی خوا ویڕای ئەوەی کە وا لەئینسان دەکات ، ڕوو بکاتە یەک ناقە ئامانجو لەڕاڕایی‌و زەین پەرتەوارەیی‌و ئەملاو لا کردن بیبارێزی ، دڵو دەروونیشی دەکاتە زەوی‌یەکی یەکجار بەپیتو پیز بۆ تێدا ڕوانی هەموو خوو و خدەو خەسلەتێکی پەسندو دلگیر ، دەزانی بۆ ؟!!

چونکە وەک دەروونناسان ئوتیان :

مرۆف بەزۆری بیر لەچ بکاتەوەو مێشکی بەچی‌یەوە سەرقاڵ بێ‌و چ شتێك زۆر لەدڵی‌دا ڕەگ داکوتراوو جەسپاوبێت ، ئەوشتە ، شوێنەواری باش یان بەد ، لەسەر ڕووبەڕی جەستەو ئاکارو ڕەفتارەکانی بەجێ دێلێ •

بۆ وێنە :

ئەو کەسەی کە لەژیانی‌دا ناقە مەبەستی گەدە تێرکردنو پۆشاك دەبەر کردنو سامان لەسەرێک کەڵەکە کردن بێ‌و ، گەورەترین پەرستراو ( معبود )ی بریتی‌بێ ، لەخواردنی چەورو شیرینو بەلەزەتو بەرگ‌و پۆشاکی گرانو بەقیمەتو چاك ڕابواردنو خۆشگوزەراندن ، دەبینین ئاژەڵ سفەتی پڕ بەپێستی وشەی تێدا دێتەدی‌و ، وەک کڵ خۆرکەیەک(٧) توند توند بەزەوی‌یەوە دەچەسپێ‌و ، جارێک لەجاران

(٧) جۆرە کرمێکی دیمەن دزێوە بەس بەگڵ خواردن دەژی !!

هێزی پاکێشانی ماددەو کەدەو بەرگ‌و پۆشاک مەودای نادات سەرێک بلیند بکاو شتێکی وەک : ئاین‌و خوا ناسی ، ویژدان ، ڕەوشت بەرزی ، چاکە کردن ، بەزەیی نواندن ، لـە سـەرووی ماددەو ڕوالەتەکانی‌یەوە بەدی بکات .

بەڵێ بابایەکی ئاوا کەبەهۆی ماددە پەرستی‌و دنیا دۆستی‌و بـەس خۆ ویستی‌یەوە ، گیانی لەخۆراکی سروشتی خۆی بێ‌بەش بووەو وەک جەستەیەکی بێ ڤیتامین‌و ، کۆرپـەیەکی بێ بەش لەسۆزی دایک‌و ، ڕووەکێکی بیشک نەدیتوو ، کـزەڵەو زەردو لاواز بووەو ، دەروونی بۆتە زەوی‌یەکی زوورکەڵێن‌و شۆرەکت‌و بێ پیت ، کە نەمامی هیچ خووو خدەو خەسڵەتێکی باشی تێـدا شین نابێ‌و ، وەک زبڵدانێکی پیسی پڕ لەپیسی‌ی لێ هاتوە ، کە گەرای هەموو نیازو گوتارو کردارێکی بەدی تێدا دەتروو کێ‌و گەشە دەکات :

بەڵام بەپێچەوانەوە :

ئەو کەسەی دڵی بەخواوە بەسترابێ‌و ئامانج‌و مەبەستی گـەیشتن بەڕەزامەندی خوا بێت‌و ، زەوی گیانی تێراوی یادی خوابێت ، دەبینی دڵ‌و دەروونی هـەتا بلێی سپی‌و سـاف‌و بێ گەردەو سروشتی بۆتـە سروشتێکی فریشتانەو ، ژیانی دیمەنی بەهارێکی بەخۆوە گرتوە کەسەدان گوڵی نیازو مەبەستی گەش‌و والاو ، نەمامی گوتارو ڕەفتاری بەرزە بالای تێدا هاتوونە دی کەمرۆڤی ژیر ناچار دەکات لەبەرانبەری دانیشێ‌و تێیدا بکەوێتە سەرنج دان‌و موتالا !

جـا ئـەگەر سەرگـەرم بوون‌و بێ حـاڵ بوونی بابایەکی وەک ( لاس )ە شۆڕی باڵەکیان سەبارەت بە خۆشەویستی‌و ئەوینی ( خەزاڵ )ە

سۆزی مەلانەیان ، وای لێ بکات ئەو هەموو لاو چاکیو ئازایەتیو مەردایەتیو فیداکاریو بەئەمەکی یەی تێدا بێتەدیو ، ئەوینو سۆزی ئافرەتێکی وەک ( شیرین ) وا سەپاوێکی وەک ( فەرهاد ) بکات کەشاکارێکی هونەری وەک : ( طاقستان )[٨] بێنێتە دی ، دەبێ خۆشەویستی پەروەردگار چ جۆرە کەسایەتی یەک بۆ مرۆڤی بڕوادار بڕەخسێنێ !!

بێگومان ئەو جۆرە کەسایەتی یەی کەبەهۆی یادی خوا و خۆشەویستی خواوە دەڕەخسێ لە گەڵ هیچ جۆرە کەسایەتی یەکی دیکەدا ناگونجێ بەراوردی پێ بگرێ .

ئایا غەزالیو مەجنوونو ، گەیلانیو عەنتەرەو ، مەولانا خالیدو لاسە شۆڕو ، سەعیدی نەورەسیو فەرهاد دەگونجێ پێک هەڵسەنگێنرێن ؟!

بۆ ئەوەی چاکتر دڵنیابی لەوەڵامی ( نەء ) سەیرێکی پەرتوو شوێنەواری هەردووک لایان بکە لەنێو گەلو کۆمەڵدا .

( حافظی شیرازی ) دەڵێت :

بلبل زفیض گل آموخت سخن ورنه نبود

این همه قولو غزل تعبیه در منقارش

واتە : بولبول لەئەنجامی فەیزی خۆشەویستی گوڵدا فێری

---

(٨) طاقستان ، کورت کراوەی ( طاق بوستان )ە ، طاق : یانی گومبەز ، یان هەر سەقفێکی کەوانەیی ، بوستان : یانی باغو گوڵزار .

قسەکردن بوو ، دەنا ئەو هەموو قسەو پەهلاکوتنە لە دەندووکیدا نەشنێررا بۆوە •

جا خوێنەری بەڕێز ! بولبولێك کە بەهۆی جوانیو بۆنو بەرامەی گوڵی ئەوینی خودایی دێتە قسەو ، ئەوەی کە بەهۆی هەر جۆرە گوڵێکی دیکەوە دێتە قسە ، حەتمەن دەبێ نەوایان ئاسمانو ڕێسمان بێ •

هەڵبەتە ئەم باسەی ئێستا دەورەی هەڵدێنو ، وەك دەریایەکی یەکجار قووڵو بێ ئامان ناوێرین خۆی لێ بدەینو بچینە نێوی ، هەویرێکی ئاو هەڵگرەو حەوجێی بەجێیەکی تەرخان کراو هەیە ، بۆیە لەگەڵ شاعیرێکی بڕواداردا چەند دێڕە شیعرێکی یەکجار گەرمو بەتین سەبارەت بە خۆشەویستی خوا دەخوێنینەوەو کۆتایی بەم باسەش دێنین ، چونکە پێم وابێ خوێنەری بەڕێزم زۆر ئازاردا بەشێوە دەربڕینو ڕستەی وردو هاڵۆز ، هەرچەندە ئەو عوزرەشم هەبێت کە واتاو مەبەستی قووڵ دەربڕینی قووڵو وردی پێویستە .

فليتــك تحلو والحيــاة مريرة
ولیتــك ترضى والأنام غضــاب

وليت الـذي بيني وبينك عامـر
وبيني وبين العــالمين خــراب

اذا صح فيــك الود فالكل هين
وكـل مـا فــوق التراب تراب

واتە : ئەی خوایە ! بریا یادی تۆم لەلاشیرین دەبوو و ژیانم سەر

لەبەر تاڵ دەبوو ، وە خۆزگە تۆم لێ ڕازی بی باخەڵکی هەموو تووڕەبن •
وە خۆزگە نێوانی من و تۆ خۆش دەبوو با نێوانم لەگەڵ هەموو جیهاندا تێکچێ •

ئەگەر تۆ خۆشت بوێم هەموو شتێکم لەلا ئاسانەو هەرچی لەسەر گڵیش بێ هەر گڵە •

## بەشی یازدەم

## یادی خوا دروشمی مسوڵمانانە

هیچ کۆمەڵو پێڕێکی ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی ئەم جیهانە نیە . کە دروشمو نیشانەیەکی سەربەخۆو دیاری کراوی نەبێ ، کەپێیەوە دەناسرێو پێی لەغەیری خۆی جیا دەکرێتەوە .

بەڵێ هیچ پێڕو کۆمەڵێك نیە کە دروشمێکی تایبەتی نەبێ ئیدی وەک مسوڵمانێك ئەوە لەبەر چاوی خۆت بگرە ، کە بێجگە لەئیسلامی خوای بالادەستو زانا ، سەر لەبەریان یان پووچو بێ نێوەڕۆکن یان ، دروشمەکە خۆی لەخۆیدا هەمووی یان بەشێکی ڕاستو دروستە بەڵام ، ئەو پێڕو تاقمەی هەڵی گرتوە ، درۆی لەگەڵدا دەکاو ، ئامانجی فریودانو بەختشە بردنو چاو بەستەکێ کردنی خەڵکە ، بەهۆی بەرز کردنەوەی ئەو دروشمەوە .

جا ئەو دروشمو نیشانەیەی کە کۆمەڵی مسوڵمانانو مرۆڤی مسوڵمانی پێی لەغەیری خۆی جوێ دەکرێتەوەو پێیەوە دەناسرێ بریتیە لەیادی خوا ، چونکە خوا ناسینو بڕوا بەخوا بوون لە ڕوانگەی ئیسلامەوە . بەگەورەترین ڕاستیو بنچینەو بەرەی تێڕوانین ( تصور )و بیرو باوەڕی ئیسلامەتی دادەنرێ .

واتە :

هەروەک چۆن بابایەکی نەتەوەپەرست ( ناسیونالیست ) ـ جا

عارەب بێ ، کورد بێ ، تورک بێ ، •• هتد ـ بەوەوە دەناسرێ کـە بەرزترین‌و گەورەترین شت لـەلای وی بـەس نەتەوەو خـاك‌و ئاوە تایبەتی‌یـەکەی خۆیـەتی‌و ، لـەلای وی باس بـەس باسـی نەتـەوەو نیشتمانە[1] ، وە هەروەك چۆن بابایەکی شیوعی‌و مارکسی[2] بەوەوە دەناسرێ کەبەرزترین‌و گەورەترین شت لەلای بەس ماددەو گۆڕان‌و پەرەستاندنی‌یەتی‌و ، باس لەلای وی بەس باسی ماددەو ئابووری‌و هۆی بەرهەم هێنانە ، لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەوە ویردی سەر زمانی بریتیە لەیادی مارکس ، ئەنگلز ، لینین ، ترۆتسکی ، ماوتسی تۆنگ ستالین ، کیم ئیل سۆنگ •• هتد •

مرۆڤی مسوڵمان‌و بڕواداریش لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوا ( الله ) بەگەورەترین ڕاستی دەزانێ‌و ، بەرنامەی وی بەتەواو ترین‌و ڕاست ترین بەرنامـە دەزانێ‌و ، بـەرز ترین ئامانجی ڕازی کـردنی خـوای پەروەردگارو بەخشندەو کاربەجێ‌یەو ، تاقە کەسێك کەبە ڕدێن سپی‌و براگەورەو ڕابەری نموونەیی خۆی بزانێ ، ئەو ( محمد )ەیە کە خوا ڕەوانەی کردوەو ، کردوویەتی پەیام بەری خۆی ، بۆلای بەندەکان ، بەڵێ لەسۆنگەی ئەوەوە دروشم‌و نیشانەیەك کە مرۆڤی مسوڵمانی پێ لەخەڵکی دی جودا وەکرێ‌و پێیەوە بناسرێ بریتیە لەیادی خوا ، بۆبە

---

(١) بڕوانە کتێبی ( اعرف مذهبك ) مارتین دودج ص٧٤ • وە ئەلقەی چوارەمی‌و زنجیرەی ( دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام‌و ڕێچکان ) بەناوی ( سۆزی نەتەوایەتی ) •

(٢) لەڕاستی‌دا شیوعیایەتی‌و مارکسایەتی هەر یەکن ، ئەوەندە هەیە شیوعیایەتی چەمکێکی گشتی تری هەیە ، ( اعرف مذهبك ) ص٣٦ ط• بیروت •

لەلای بابای مسولمان باس بەس باسی خوایە •

بەڵێ یادی خوا ، بەس درروشمی مرۆڤی مسولمانو بڕوادارە ، بۆیەش وەک لەبەشەکانی ڕابردوودا ڕوون بۆوە ، دەرکەوت کە بابای مسولمان بەهۆی یادی خواوەو لەدەمی یادی خــوادا ئارامیو ئۆخژنو دڵنیایی دێتە نێو دڵو دەروونەوە ، بەلام بابای نامسولمانو بێ بڕوا ، جا نامسولمانەتی‌یەکەی ئاشکرابکات یان نا – واتە کوفرو بێ‌بڕوایی‌یەکەی پەنهان بکاتو بی‌شارێتەوەو بەدرۆ خۆی بەمسولمان پیشانبدات – ، یانی کافرێکی بە ئاشکرابێ ، یان بەدزی کەبێی دەگوترێ دوو ڕووو دەغەڵ ( منافق ) ، ئەوە بە بەراوەژووەوە لەجیاتی دڵ دامرکانو سێبووری هاتن ، بەیادی خوا دڵی دەگووشرێو ڕێک دێو ڕووی گرژو تاڵ دەبێ •

هەڵبەتە لێرەدا کەدەڵێین : یادی خوا ، مەبەستمان باسکردنی خواو هەر مەبەستێکی دیکەیە کە پەیوەندی بەخواوە هەیە ، وەك باسی ئیسلامو پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم زیندوو بوونەوەو هەر شتێکی دیکەی لەم بابەتانە •

مادام وابێ ، خوێنەری ئازیز !

دەتوانین بڵێین : یادی خوا تەرازووو سەنگی مەحەکێکی زۆر چاکە بۆ هەڵسەنگاندنو نرخاندن ( تقییم )ی هەموو جۆرە مرۆڤێك •

هەرکەسێکت دی بــەهۆی یادی خواو باسکردنی پێغەمبەرەکەیو بەرنامەکەیەوە دڵی دەکرایەوەو ، ڕووی دەگەشایەوەو کەیفو شــادی ڕووی تێ دەکردو هــەستی‌بە ئارامیو تــەسکینی هاتو ڕەزامــەندی دەکرد ، ئەوە سوپاسی خوای لەسەر بکــەو سووراو سوور بزانە دڵو

دەروونی بڕوای تێدایە •

وە بەپێچەوانەوە هەر کەسێکت دی کەبەهۆی باسکرانی خواو پێغەمبەرو صلی الله علیه وسلم ئیسلامەوە ، نێوچاوانی گرژو دەمو چاوی مۆنو مرچ دەبوو و ڕەنگ دەهانو دڵو هەناوی دەگووشرانو دەروونی پەست دەبوو و ، ئەگەر بۆی لوابا هەوڵی گۆڕینی ئەو باسە ، یان بەجێ هێشتنی ئەو کۆڕەی دەدا ، ئەوە زۆر چاك بزانە : دڵی پڕ لەچڵكو چەپەڵی کوفرو بێ بڕوایی‌یەو دەروونی زەنگاویو پیسەو ، مێشکی بەنج کراوی تریاکی پیسی جۆرێك لەجۆرەکانی بیرو بۆچوونو بیردۆزەی بەدو بێ خێری ئیبلیسە !!(٣)

---

(٣) ئەمن بۆخۆم ئەو جۆرە هەڵوێستانەم لەمرۆڤی نامسوڵمانو دڵ نەخۆشو بۆ ڕێچکەی شەیتانی بەجۆش ! یان بەناو مسوڵمانی بێ هۆشو گۆشو شایستەی دل پێسووتانو پەرۆش ! زۆر دیون ، بۆ وێنە :

جارێکی لەکۆڕێکدا باسی لایەنی ئیعجازی زانیاری قورئانمان دەکرد ، یەکێك لەدانیشتوان کە دەرچووی کولێجی پەروەردە بوو ، بەڵام بەبیرو بۆچوونی ئاشنا نەبووم ، زۆر ڕەزامەندی دەردەبڕیو پێ خۆشحاڵی پیشان دەدا ، ئەمما کاتێك هاتینە نێو باسی سیاسەتی ڕۆژەوەو ، باسی بارو دۆخی ئێستای کوردمان کردو هاتینە سەرباسی ڕێی ڕزگاریو چارەسەر ، گوتم :

هەروەك چۆن ڕژێمی فلانی چونکە سەر بەیەکێك لەڕێچکەو بیرە دەستکردە شەیتانی‌یەکانە ، بۆیە ستەمو زۆر دەکات کەواتە : کوفرو بێ بڕوایی، ڕێچکەی مرۆڤکرد هەموو دەمێ هەر چەوساندنەوەو ستەمو زۆرو ئازاردانی لەهەگبەی دایە ، جاکەیفێ خۆیەتی : نەتەوە پەرستی بێ ، سەرمایەداری بێ ، مارکسایەتی بێ ، هەرچی بێ ، بەڵێ هەرکە ئەمەم گوت ، کابرا وەك ماری بریندار خۆی گێف کردو هاتە سەر چۆکانو گوتی :

خوای بەهەموو شتێك راناو لەهەموو نهێنییان ئاگادار سەبارەت بەو جۆرە کەسانە فەرموویەتی :

[ واذا ذکر الله وحده اشمأزت قلوب الذین لا یؤمنون بالآخرة واذا ذکر الذین من دونه اذا هم یستبشرون • ] الزمر ـ ٤٥ •

---

چۆن مارکسیزم ( شیوعیایەتی ) چەوساندنەوەو ستەمو زۆری لەهەکبەی دایەو خێری پێوە نیە ، مەگەر مارکسیزم هەلگری مەشخەلی شۆڕشی ئازادیخوازی گەلە چەوساوەکانی جیهان نیە ؟!!
گوتم : نەخێر ـ •
گوتی : ئاخر بەچ بەلگە ؟!

پێم گوت : ئەگەر مسولمانی بە بەلگەی قورئان کەدەفەرموێ : ( فماذا بعد الحق الا الضلال ؟ ) یونس ـ ٣٢ • یانی : لەدوای هەق ـ ـ بەرنامەی خوا ـ بێجگە لە گومڕایی‌و سەرگەردانی چ هەیە ؟! دیسان کە دەفەرموێ : ( أفحکم الجاهلیة یبغون ، ومن احسن من الله حکما لقوم یوقنون ) المائدە ـ ٥٠ • یانی : ئایا ڕژێمی نەفامی دەخوازن ، جا بەرنامەی کێ لەئی خوا باشترە بۆ گەلێکی بڕواپتەو ؟! وەئەگەر نامسولمانیشی گوێم بۆبگرە تا تۆزێك بۆت باسی مێژووی کۆمۆنیزم‌و مارکسیزم بکەم‌و بۆت ڕوون بکەمەوە ، کە لەژێر پەردەی ئازادیخوازی‌و درووشمی کرێکار ویستی‌دا ، چ بەلایەکی گەورەی بەسەر مرۆڤایەتی بەگشتی‌و ئەو شوێنانەی کە تێیاندا بەڕێوە براوە بەتایبەتی هێناوە !!
لێرەدا قسەکەی پێ بڕیم‌و گوتی :

کەواتە قورئان مارکسیزم‌و کۆمۆنیزم بە ( ضلال )و ( جاهلیة ) لەقەلەم دەدات ! گوتم : بەلێ مارکسیزم‌و غەیری مارکسیزمیش •
گوتی : ئەدی بۆ هەتا ئێستا نەمزانیوە کەقورئان هەلەی وای تێدایە !
ئەلێرەدا کابرا لەو برە بڕوا قرپۆکەو بێ‌خێرەشی پاشگەز بۆوەو بووبە کافرێکی ئاشکراو هەرچەندی گردیشم بۆ وتووێژ لەگەلم دانەنیشت‌و سەرو دلی بەدوو ئایەتی خوا گەوتنە لێش‌و ژان •

واتــه :

وەکاتێك بەتەنیا باسی **خوا** بکرێ ـ بگوترێ ئیسلام بەرنامەیەکی هەمەلایەنەی ژیانەو حەوجێی بەپێنەی بیردۆزان نیە ـ ئەوانەی بڕوایان بــەدوا ڕۆژ نیــە دڵیان دەگوشرێو بێزار دەبن ، بــەڵام ئەگــەر باسی ئەوانەبکرێ کە لەچاو خوا هیچ نین ، ئەوە دڵیان دەگەشێتەوە •

دیسان پەروەردگار فەرمووبەتی :

[ ان المنافقين يخادعون الله وهو خادعهم ، واذا قاموا الى الصلاة قاموا كسالى ، يراؤن الناس ولا يذكرون الله الا قليلا • ] النساء ـ ١٤٢ •

واتــه :

دوو ڕووو دەغەلەکان دەیانەوێ خوا فریوبدەن ، بەڵام لە ڕاستیدا خــوا ئــەوان فریودەدات ، وەکاتێ بۆ نوێژێ هــەڵدەستن بەتەوەزەلی هەڵدەستن ، وەبەدەگمەن نەبێ باسی خوا ناکەن •

هەڵبەتە ئەو بەدەگمەن یادی خوا کردنو تاکو تەرا نوێژ کردنەی بەرچاوی خەڵکی !! دیارە بۆ خوا نیەو بابای مونافیق دەیەوێ بڕوادارانی پێ هەڵخەڵەتێنێو چاوبەستەکێیان لێ بکات ، بەڵام خەیاڵ پڵاوی کردوەو مسوڵمان زور لەوە ژیرو وریاترن ، کە بەدوورکات نوێژی ڕیابازانەی نمانۆگەرییانــەو ، دوو دڵۆپە فرمێسك هەڵوەراندنی ساختەچییانــەی ئەکتەرانەو ، چوونــه مزگەوتو تەنانــەت مزگەوت دروست کردنێکی فێلبازانه ، بریو بخۆنو هەڵخەڵەتێن !!

بەڵێ خوێنەری بەڕێز !

یادی خوا درووشمی هەرەبەرزی مسوڵمانانه ، چونکه لەڕاستیدا

مرۆڤ ، چ شتێکی زۆر لەیادبێو پێیەوە سەرگەرم بێو باسی بکات ، دیارە خۆشەویستی ئەو شتەی لەدڵدا چەسپیوەو تێکەڵ بەگیانو دەروونی بووە ، جا بێگومان مرۆڤی مسولمان پێویستە خوای پەروەردگاری لەهەموو شتێك لەکن شیرین ترو بەڕێز ترو خۆشەویست تر بێت ، بۆیەش لەقورئانی بەڕێزو فەرموودەی بەڕێزی پێغەمبەرماندا ، دەبینرێ کەیادی خوا ( ذکر ) وەك دروشمو نیشانەیەکی تایبەتی مرۆڤی مسولمان خراوەتە ڕوو .

ئنجا جێی داخو پەژارەو خەفەت ئەوەیە ، کەزۆربەی هەرە زۆری مسولمانانی [٤] !! ئەمڕۆ ، قەت قەت هێندەی باسی زێڕو پارەو خواردنی چەورو بەلەزەتو ، پۆشاکی گرانو بەقیمەتو ، پلەو پایەو کۆشکو تەلارو ، ئامێرو کەلو پەلو ، پیاوی زۆردارو ، ڕێچکەی خوارو ، بیردۆزەی ناهەموارو ، پێرو دەستەی بێ بارو نالەبار دەکەن ، نیوەی نیو ئەوەندەش باسی خوا ناکەنو گومانیشیان وایە بەهەشت لەبەر وان وەبەر کەس ناکەوێ !!

بەڵام واللّە بیرو بۆچوونیوا دەردەو دەرمانی دەوێ !



---

(٤) بۆیە نیشانەی سەرسوڕمانم داناوە ، چونکە بەخۆ بەراورد کردن لەگەڵ قورئانو سوننەتدا مسولمانەتی‌یەکی یەکجار سەیرو سەرسووڕهێنەر دێتە بەر چاو !!

# لەکۆتاییدا

## خوێنەری سەنگین !

سوپاس بۆخوای هەموان کەلەم بەشی یەکەمی [ یادی خوا ]یەدا توانیمان تا ئەندازەیەك چەمكو مەبەستی ( یادی خودا ) ڕوون بکەینەوەو ، دەری خەین کەتا چ ڕاددەیەك گرنگو کاریگەرە لەژیانی مرۆڤدا •

جا ئێستا پێم وایە هەرچی ئەم بەشەی بە وردیو بە تێگەیشتنەوە خوێندبێتەوە ، دڵی بەیادی خوادا چووەو ، لەلای شیرین بووەو ، حەزدەکات یادی خوا بکات ، بەڵام ڕەنگە بڵێ : ئاخر چ بکەم ! چۆن یادی خوابکەم ؟!

ئێمەش لەوەڵامدا دەڵێین : شێوازو چۆنیەتی یادکردنی خوا ، بابەتی بەشی دووەمی ئەم کتێبەیەو خوا پشتیوان بێ ، ئەگەر کۆسپو تەگەرە نەیەنەپێش ، زۆری پێ ناچێ ، بەدیدارتان شاد دەبێ •

تاقە داواکارییەکیشم کە لەخوێنەری ئازیز هەبێ ئەمەیە :

هەتا پێت دەکرێ وردو پشوو درێژو هێدیو بیر سافو دڵ ڕووناك بە ، لەدەمی خوێندنەوەی ئەم نوسراوەدا ، چونکە دەروێش بۆخۆی دەزانێ جی لەکەشکۆڵێدا هەیە ! ئومێدم وایە ئەم نووسراوە بێتو

پێزێکی زۆری پێوە بێ ، دیسان زۆر جاران قووڵی مەبەست ، ناچاری کردوین پەنا بەرینە بەر شێوە نەعیری بڕێك ورد ، جا ئەگەر وەك پێم گوتی وانەبووی ، لەحاڵی نەبوونتدا گلەیی‌و گازندە مەکە !!

ئنجا با دوا قسەشمان پێش لێك ترازان(۱) فەرموودەیەکی زۆر پڕ واتای پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بێت کە دەفەرموێ :

[ اللهم أقسم لنا من خشيتك ما يحول بيننا وبين معاصيك ومن طاعتك ما تبلغنا به جنتك ، ومن اليقين ما يهون علينا مصيبات الدنيا ، ومتعنا بأسماعنا وأبصارنا وقوتنا ما أحييتنا ، واجعله الوارث منا ، واجعل ثأرنا على من ظلمنا ، وانصرنا على من عادانا ، ولا تجعل مصيبتنا في ديننا ، ولا تجعل الدنيا اكبر همنا ولا مبلغ علمنا ، ولا تسلط علينا من لايرحمنا • ] رواه الترمذي والحاكم عن ابن عمر •

واتـە :

ئەی خوایە ! هێندەمان ترسی خۆت بەش بدە ، کە لە تاوانەکانت بمان گێڕێتەوە ، وەهێندەمان فەرمانبەریی پێ ببەخشە کەپێی بچینـە بەهەشتەکەت ، وەهێندەمان بڕوا پێەوی بدەیە کەبەڵایەکانی دنیامان لەلا ئاسان بکات ، وەهەتا لەژیاندا دەمان هێڵیەوە گوێ‌و چاوو هێزو توانامان پێ بهێڵە ، وە بیانکـە بەمیراتگـرمان • وە تۆڵەمان بۆ لـەوانـە بسێنە کەستەممان بێ دەکەن ، وە بەسەر ئەوانەدا سەرمان بخە کە دوژمنایەتیمان دەکەن ، وە لەئایینماندا بەڵامان بۆ مەنێرە ، وە با هەڵبژاردنی دنیا نەبێتە گەورەترین ئاوات‌و مەبەستمان‌و ئەوپەڕی زانیاریمان ، وە کەسێکمان بەسەردا زاڵ مەکە کە بەزەیی پێماندا نایەتەوە • ئامین •

---

(۱) چونکە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم کەم وابووە لە کۆڕێك هەستێ‌و ئەم دووعایە بۆ برادەرانی نەخوێنێ •

## فەرھەنگیلە

ئیشکە گرتن : بەدیار شتێکەوە دانیشتن بەنیازی پاراستنی .

ئیفلیج : شەبڵەدار ، شەبڵە لێدراو .

بەرۆکی گرتووین : یەخەی پێ گرتووین ، بەرەنگرمان بووە .

پرێسکە : پارچە پەڕۆیەک کە شتێکی تێ بەسترابێ .

پێگیری : پێداگرتن ، سوور بوون لەسەر شتێک .

حەوجار حەوجار : ئەم وشەیە لەجیاتی ( بطریق الاولی )ی عارەبی بەکار دێت .

چۆک دادان : خۆ ھێنانە سەر چۆک ، چۆک : ئەژنۆ ، گەردن کەچ کردنو مل کز کردن .

چەنگە پرچە : دووبەرەکی ، ناکۆکی ، بەشەڕھاتنێکی ئاسایی .

درێژ بوون : ڕاکشان ، وەرکەوتن .

دایمو دەرەم : ھەمیشە ، بەردەوام .

| | |
|---|---|
| ڕۆ چوون : | قـم بوون ، چـوونە خـوارەوە بەتەنێکدا ، قووڵ بوونـەوەو ورد بوونەوە • |
| سەرتێ وەستان : | حەوجێ بوون ، پێویستی پێ‌بوون ، یەک لەسەر کەوتن • |
| سندان : | نەخۆشی‌یەکی سەختو کوشندە ، کاڵەکی سـندان لێـدراو : مێش لێدراو ، گەندەڵ • |
| شەپڕێو | شیرزە ، حاڵ تێکچوو • |
| شیرە شیر : | بـەتوندیو تووڕەیی قسـەکـردن ، قیژاندن • |
| قنیات : | قـەناعـەت ، ڕازی‌بوون ، دڵ داکەوتن • |
| مەرگە مووش : | لەئەسـڵدا جـۆرە زەهـرێکی کوشندەیە بـۆ لـەنێوبردنی مشکان بەکاردێ ، بڕوانە فەرهەنگی خاڵ ب٣ لاپـەڕە (٣٠٦) ، **بەڵام دوایی** بۆهـەر دەردێکی دژوار بـەکـار هاتوە • |
| نەترەی چوو : | زندەقی چوو ، زراوی ڕژا ، تۆقی • |

| | |
|---|---|
| نرکەنرک : | دەنگێکی قەبەی زل کەلەسینک دێتە دەرێ • فەرهەنگی خاڵ ب٣ لاپەڕە (٣٣٩) • |
| هەڵخران : | سازکران ، دروست کران • |
| هەڵبە هەڵپ : | پەلە پەل ، خۆ ڕانەگری و پشوو کورتی • |
| هەڵبردن : | هەڵبواردن ، بەسەردا ڕەت بوون • |
| هەڵبڕینەوە : | خۆ هەڵبڕینەوە ، خۆ ئامادەکردن ، خۆ بەرزکردنەوە ، خۆگیف کردن |
| هەڵبزرکان : | ڕەنگ زەرد هەڵگەڕان ، ڕەنگ سپی بوون ڕەنگ تێکچوون • |

تێ بینی :

هەر وشەیەکی دیکەت لێ ئاسێ بوو ، سەرنجی فەرهەنگیلەی کتێبی [ بوختەیەک دەربارەی ئیسلام ]و بەشی یەکەمی زنجیرەی ( دەبەرێک ڕاجوونی ئیسلام و ڕێچکان )بدە •

# کاکلی باسەکان

زۆر سوپاسی برای سەنگین و خۆشەویستم کاک محمدی ملا ابراهیم آغا دەکەم کە ئەرکی سەر پەرشتی کردنی چاپ کردنی ئەم ،کتێبەی وەئەستۆ گرت خوا پاداشی بداتەوەو وێنەی زۆر بکات •

# ئـەم کتێبە

یادی حودا چی‌یە ؟!

مرۆڤی خوا لەیاد کێ‌یەو چۆنە ؟!

لە خوا بێ ئاگابوون چ کارەساتێك بەسەر مرۆڤایەتی دێنێ ؟!

یادی خـوا چ پەیوەندی‌یەکی بەبڕوا بەخوا بوونو خۆشویستنی پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم هەیە ؟!

ئایا یادی خـوا دەبێتە هـۆی دوورکەوتنەوە لە خراپەو تاوانو ، پارێزران لە دەردو نەخۆشی‌یە ڕواڵەتی‌و دەروونی‌یەکانو ، زاڵ بوون بەسەر کۆسپو گیرو گرفتەکاندا ؟!

ئایا ڕاستە لێك نیزیك بوونەوەو پێکـەوە جۆشـدرانی مسوڵمانان بەرهەمی یادی خوداو لەگەڵ خودا بوونە ؟!

دروست بوونی کەسایەتی « شخصية » چ پەیوەندی‌یەکی بەیادی خواوە هەیە ؟!

پەیوەندی نێوان یادی خزاو تێکۆشان « جهاد » چۆنە ؟!

بۆچی یادی خودا بەدرووشمی مسوڵمانان دادەنرێ ؟!

ئەم کتێبە وەڵامی هەموو ئەم پرسیارانەت دەمست دەنێ •



نرخی (١٢٥٠) فلسە